

# DICTIONARY OF GEOLOGY

## ENGLISH - KURDISH


**Prepared by:**

Dr.Ibrahim M.J. Mohyaldin
*Ph D Geology*

Babarasul G. Essa
B.Sc.Geology

Kaiwan M. Raza
B.Sc.Geology



First Edition 2002
Second Edition 2009 (Electronic)

# DICTIONARY OF GEOLOGY

English-Kurdish

Prepared by:

Dr.Ibrahim M.J.Mohyaldin
*MSc, Ph D*

Babarasul G. Essa
*B Sc Geology*

Kaiwan M. Raza
*B Sc Geology*

*First Edition 2002*
*Second Edition 2009 (Electronic)*

*Sulaimani, Kurdistan*

-***Dictionary of Geology*, English-Kurdish**

-*Mohyaldin, I.M.J., Essa, B.G., and Raza, K.M.*


-***2009*** *Second Edition (Electronic)*
-*Printed by Badrkhan Printing Company,
Sulaimani, Kurdistan*



-*Cover photograph:*
*Cross- section showing anticlines and syncline cut by small faults in Balambo Formation, covered by a thin layer of soil.*
*Location: Near crest of the Azmer anticlinorium, Sulaimani, Kurdistan (photo by Karzan A. Ahmed).*

پێشەکی یەکەم چاپ

## بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

### خوێنەری ئازیز....

سەردەمێکە زانستی زەویناسی( Geology ) لەکوردستاندا هەنگاوی باشی ناوەو ئێستا بەدەیان شارەزای ئەم زانستە لەزۆرینەی شارەکاندا و لە بوارەجیاجیاکانی وەك هەڵکەند نی بیری نەوت و ئاو و خاوەکان و ئە نجامدانی ڕوو پێویدا بلاوبۆتەوەو زانکۆکان بونەتە مەڵبەندی ئەم زانستەو بەدەیان خوێندکاری کورد لەبەشەکانی زەویناسیدا لەناوەو دەرەوەی کوردستاندا دەخوێنن.

ئەوەی جێگەی سەرنجە هەوڵدان بۆ نووسین و وەرگێڕان لەم بوارەدا، بەبەراورد لەگەڵ زانستەکانی تردا، زۆر کەمە و ئەگەر هەشبێت زۆر سادەو سەرەتاییە. تا ئێستا زۆرینەی سەرچاوەکان بەزمانی بیانییە و سەرچاوە بەزمانی کوردی وەکو پێویست نییە. بەبۆچونی ئێمە یەکێك لەوهۆکارانەی کەئەم بارەی دروستکردووە ، نەبوونی بەرامبەرە بۆ وشەو زاراوەکانی ئەم زانستە لەزمانی کوردیدا، ئەمەش وادەکات نووسین یان وەرگێڕان کارێکی ئاسان نەبێت، زۆر کێشە بۆ نووسەر یان وەرگێڕ لەکاتی نووسیندا دروست بکات.

ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی نووسراوەکانی بواری زەویناسی بەوشەو زاراوەی بیانی ئاخنرابێت، تەنیا پسپۆڕانی ئەو زانستی لێیتێبگەن. هەنگاوی سەرەتا بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشانەو زیاتر گەشەکردنی نووسین لەم بوارەدا دروستکردنی وشەو زاراوەی بەرامبەرە بۆ زاراوەکان و شیکردنەوەیانە، ئەمەش لەبنەڕەتدا کاری فەرهەنگ دانانە یان ئامادەکردنە. چونکە بوونی فەرهەنگ دەبێتە پاڵپشت بۆ نووسەران و بۆ ئەوخوێندکارانەی کەلە پەیمانگاکانی تەکنەلۆجیاو کۆلێجەکانی زانست و ئەندازیاری وکشتوکاڵ دەخوێنن و هەمیشە وەك سەرچاوەیەك بەکاری دەهێنن.

لەم ڕوانگەیەوە و پاش هەستکردن بە پێویستی بوونی فەرهەنگێکی زەویناسی، هەوڵماندا کەلەچوارچێوەی ئەم فەرهەنگەدا زۆر لەزاراوە زەویناسییەکان کۆبکەینەوەو بەرامبەریان بۆ دابنێین وبەکورتی تیشك بخەینەسەر هەر یەکێك لەو زاراوانە.

بێگومان هەندێك لەو وشانە وەك خۆی، بنەما لاتینییەکەی، ماونەتەوە ئەوەش لەبەر نەگەیشتن بەبەرامبەرێکی گونجاو بۆ ئەو وشانە یۆیەبەباشمانزانی کەوەك خۆیان بمێننەوە بەوهیوایەی کەلەداهاتودا وردەوردە بەرامبەریش بۆئەوانە دابنرێت.

لەکۆتاییدا بە پێویستی دەزانین کەسوپاس و پێزانینی خۆمان بۆ گشت مامۆستایانی بەشی زەویناسی ،کۆلێجی زانست، زانکۆی سلێمانی دەربڕین کەلێبوردوانە و هەریەکێك لەبواری پسپۆڕی خۆیدا ئەرکی پیاچوونەوەی وردی ئەم فەرهەنگەی گرتەئەستۆو گشت ڕەخنەو پێشنیارەکانیان بەرهەمەکەی دەوڵەمەندترکرد.ڕێزمان بۆ د.علی سورداشی لەبەشی زەویناسی/کۆلیجی زانست،زانکۆی

سەلاحەدین، کەبەگفتوگۆکردن لەسەر چەند زاراوەیەك هاوکاری کردین. سوپاسی گەرم بۆ ماموٚستای بەڕێز کەمال جەلال غەریب کە ڕەخنەو پێشنیارەکانی بوونەهۆی گەشەکردن و پێشخستنی فەرهەنگەکە. سوپاس بۆ بەڕێزان د. هۆگر محمود وم. ابوبکر عمر ود. محمد عبدالفتاح لەبەشی زمانی کوردی، کۆلیجی زمان، زانکۆیسلێمانی بۆ یارمەتیدانیان لەبواری زمان دروستی و پیاچونەوەی هەندێك بەشی ئەم فەرهەنگە. سوپاس و پێزانین بۆ ماموٚستا احمد میرزا کە پێشەکییەکەی لەرووی زمانەوانییەوە بۆ چککردین. ڕێزو پێزانین بۆ زەویناس زەردەشت ئەحمەد عبداللە سەرۆکی لقی سلێمانی کۆمەڵەی جیۆلۆجی کوردستان بۆهاوکاری کردنی بەردەوامی. هەروەها سوپاس و پێزانین بۆ کۆمەڵەی جیۆلۆجی کوردستان/لقی سلێمانی کەئەرکی چاپکردنی ئەم بەرهەمەی گرتەئەستۆو هیوادارین ئەمەدوا بەرهەم نەبێت وکاری نوێی بەدوادا بێت. سوپاسی بێپایان بۆزەویناس خاتوو تاڤگەفایەق کەکاری چاپ و دەرهێنانی هونەری گرتەئەستۆ.

خوێنەری بەڕێز.....

بەو پەڕی دڵفراوانی وسوپاسەوە چاوەڕێی گشت ڕەخنەو پێشنیارەکانتانین وبێگومانین کەکارێکی ئاوا بێ کەم و کوڕی نابێت و هاوکاری گشت لایەکی پێویستە. دەتوانن گشت بۆچوونەکانتان بەم ناونیشانەبنێرن:

ibrahimjaza@hotmail.com

*دووبارەسوپاستان دەکەین*

ئیبراهیم محەمەد جەزا محێدین
بابا ڕەسول غەفورعیسا
کەیوان محەمەدڕەزا
کوردستان/سلێمانی
2002 زاینی-2702 کوردیی

<u>پێشەکی دووەم چاپ</u>

خوێنەری بەڕێز....

ئەم چاپی دووەمە کەتەنها بەشێوەی ئەلکترۆنی و بێبەرامبەر لەسەر ماڵپەڕەکان هەیە، لەسەر داوای زۆر لەخوێنەرانی ئازیزەکانم ئامادەکرایەوەو بەهیوای لەداهاتویەکی نزیکدا لەبەرگێکی گەورەتر و پڕ لەوشەوزاراوەی تازەدا بکەوێتەبەردەستتان. هەڵبەت ئاواتم ئەوەیەکە سوود مەند بێت و کەلێنێك لەکتێبخانەی کوردی پڕبکاتەوە.

د. ئیبراهیم محەمەد جەزا محێدین
ibrahimjaza@yahoo.com
سلێمانی 2009

# -Aa-

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| *Abdomen* | سك |
| *Aber* | دوو ئاوان: شوێنی بەیەکگەیشتنی دوو رووبار. |
| *Ablation* | لابردن |
| *Ablaze* | گڕگر |
| *Abnormal* | ناوازە |
| *Aboral* | دەمی ، زاری |
| *Abrasion* | کڕاندن: داخورانی کەڤرەکان بەهۆی ئەو وردە بەردانەی کە هۆکارە سروشتییەکانی وەك باو ئاو و سەهۆڵ هەڵیدەگرن. |
| *Abscissa axis* | تەوەرەی سینی |
| *Absolute age* | تەمەنی رەها |
| *Absorption* | مژین:پێدابڵاوبوونەوەی بەشەکانی مادەیەکە بەنێوان هەموو بەشەکانی مادەیەکی تردا. |
| *Abstract* | پوختە |
| *Abundance* | زۆرینە: ژمارەی تاکەکانی یەك جۆر لە رووبەرێك یان قەبارەیەکی دیاریکراوی نیشتووەکاندا. |
| *Abyssal* | قوڵایی زیاتر لە 2000م لە دەریاکاندا. |
| *Abyssal injection* | ستوونە هەڵچوون: بریتییە لە کرداری بەرز بوونەوەی ستوونی ماگما بەناو درزە قوڵەکاندا. |
| *Abyssal deposits (pelagic deposits)* | نیشتەی قوڵاییەکان |
| *Abyssal rocks* | کەڤری قوڵاییەکان |
| *Acceleration* | تاودان |
| *Accessory minerals* | خاوە لاوەکییەکان: بەو خاوانە دەوترێت کە رێژەیەکی کەمی کەڤرەکان پێکدەهێنن و کارناکاتە سەر ناونانی کەڤرەکە. |
| *Accordance* | رێکەوتن |
| *Accretion* | زۆربوون |
| *Accumulation* | کۆبۆوە |
| *Accuracy* | وردی |

*Acep/Adre*

| | |
|---|---|
| ***Acephalia*** | بێسەرەکان |
| ***Ac – joint(cross joint)*** | پانە نێوانە روو: بەو نێوانە روانە دەوترێت کە ئەستونن لەسەر تەوەرەی چینە چەماوەی کەڤرە نیشتوەکان. |
| ***Achondrite – Meteorite*** | بەردە ئەستێرە |
| ***Achromatic*** | بێڕەنگ |
| ***Acicular*** | دەرزیلەیی: بەو کریستالآنە دەوترێت کە شێوەی دەرزیلەییان هەیە. |
| ***Acid*** | ترشەڵۆك |
| ***Acidity*** | ترشێتی |
| ***Aciform*** | شێوە دەرزیلەیی |
| ***Acinose*** | دەنکۆڵەیی |
| ***Aclinal*** | هێڵی کەمەرەی موگناتیسی |
| ***Action*** | کردار |
| ***Activity*** | چالاکی |
| ***Actual*** | راستی |
| ***Acute bisectrix*** | لەنگەری گۆشەتیژ |
| ***Acyclic*** | ناخولگەیی ،ناخول ، وەستاو |
| ***Adamant (Diamond)*** | ئەڵماس یان برپلیان |
| ***Adambulacrum (Echinodermata)*** | پێست دڕکاوییەکان: پۆلێکە لە گیاندارە بێبڕبڕەکان، تیشکە هاویەکن پەیکەرەکەیان کلسییە. |
| ***Adaption*** | خۆگونجاندن: گۆڕانی بوونەوەر یان بەشێکیبۆ زیاترخۆگونجاندن لەگەڵ بارو دۆخی ژینگەدا. |
| ***Adductor muscle*** | ماسولکە نزیککەرەوە: ئەو ماسولکەیەیە کە لە لەشی پێبازوویەکان یان توێکڵدارەکاندایە و بە گرژبوونی لەپکەکان دادەخرێن. |
| ***Adhesion*** | هێزی پێکدانووسان |
| ***Adit*** | ژێر زەمین |
| ***Adjacent*** | تەنیشت |
| ***Adjustor muscle*** | ماسولکە راگر: ئەو ماسولکەیەیە کە لە لەشی پێبازوویەکاندا هەیە و دەبێتە هۆی تەواو جووت بوونی هەردوو لەپکەکان. |
| ***Admixture*** | تێکەڵە |
| ***Adont*** | بێددان |
| ***Adradial suture*** | درزە تیشکییەکان |
| ***Adret*** | لێژی کەمەرەیی: بەو شوێنە لێژە دەوترێت لە چیاکانداکەزۆرترین بڕی تیشکی خۆری لێ دەدات. |

*Adso/Aley*

| | |
|---|---|
| **Adsorption** | روو مژین:مژین وپێدابلاوبوونەوەی گەردەکانی گازێکە بەنێوان گەردیلەکانی(رووی)کانزا یان ناکانزایەکدا. |
| **Advance** | پێشکەوتوو |
| **Adventive** | کتوپڕ |
| **Adverse** | دژ |
| **Aeolian** | هەوایی، بایی |
| **Aeolian deposits** | نیشتە بایییەکان (نیشتە هەوایییەکان) |
| **Aeon (Eon)** | چەرخ: بڕوانە (Eon) |
| **Aerobic** | بوونەوەرە هەوایییەکان: ئەو بوونەوەرانەن کەلە هەوادا دەژین دور لە ئاو و خۆڵ. |
| **Aerolites-Meteorites** | بەردە ئەستێرە: بڕوانە Achondrite. |
| **Aeromagnetic survey** | موگناتیسە پێوی ئاسمانی |
| **Affinity** | ئاوێتەبوون (هۆگری): پەیوەندییەکی بنچینەییە لەنێوان دووجۆر یان زیاتر لە بوونەوەراندا. |
| **Affluent** | جۆگە :ڕێڕەوێکی ئاوییە دەڕژێتە ناو ڕێڕەوێکی ئاوی ترەوە. |
| **Age** | تەمەن: بریتییە لە تەمەنی جیۆلۆجی ڕەها یان ڕێژەیی کە جۆرە کەڤرێك تیایدا دروست بووە. |
| **Agent** | هۆکار |
| **Agglomerate** | چەوی گڕکانی: بریتییە لەو کەڤرەی کە پێکهاتووە لە یەکگرتنی وردە بەردی گڕکانی خڕ. |
| **Agglutinated** | پێکانووسان |
| **Aggradation** | ڕێککردنەوە |
| **Aggrading river** | ڕووباری نیشێنەر |
| **Aggregate** | کۆبووەوە |
| **Aggregation** | یەك پارچەبوون |
| **Agitate** | جوڵاو |
| **Agonic line** | هێڵی لادان |
| **Agrology** | خۆڵزانی |
| **Air survey** | پێوانی ئاسمانی |
| **Alabaster** | جیبسۆمی پتەو: جۆرێکە لە کەڤری جیبسۆم کە دەنکۆڵەکانی وردەو پتەوە. |
| **Alar septum** | باڵە بەربەست |
| **Aleyonaria** | شیلانی هەشتی |

| | |
|---|---|
| ***Algae*** | قەوزە |
| ***Algal limestone*** | بەردە کلسی قەوزەیی |
| ***Algal reef*** | مۆڵگەی قەوزەیی |
| ***Alkaline*** | قلیەیی |
| ***Allochthonous*** | گوێزراوەکان، بێیانەکان: ڕەوشتێکی ئەو کەڤرانەیە کە لەشوێنی دروستبوونیانەوە گوێزراوەتەوە. |
| ***Allochem*** | دەنکۆڵەی پەیکەری |
| ***Allotropic*** | هەمە شێوە |
| ***Alloy*** | داڕشتە |
| ***Alluvial deposits*** | نیشتووە ڕووبارییەکان |
| ***Alluvial fan*** | پەروانە ڕووبارییەکان |
| ***Alpha particle*** | دەنکۆڵەی ئەلفا |
| ***Alpine orogeny*** | ئۆرۆجینی ئەلپاینی |
| ***Alteration*** | پێکهاتە گۆڕان، گۆڕان: جیاوازی پێکهاتنی کیمیایی یان فیزیایی یان هەردووکیان لە کەڤر یان خاوی بنچینەیدا. |
| ***Alternation*** | دواییەك، بەرودوا |
| ***Alternative*** | هەڵبژاردن |
| ***Altimeter*** | بەرزیپێو: ئامێری پێوانی بەرزایی بە ڕێژەی ئاستی دەریاوە. |
| ***Alunite*** | زاخە بەرد |
| ***Aluminum*** | ئەلەمنیۆم |
| ***Amber*** | کارەبا (عنبر): کەتیرەیەکی بەبەردبووە کە لە ئەنجامی بوون بە بەردی دەرهاویشتەی سنەوبەرییە کۆنەکانەوە دروست بووە. |
| ***Ammonites*** | تەزبیحییەکان |
| ***Amorphous*** | نابلووری: ڕەوشتێکی ئەو خاو و کەڤرانەیە کە شێوەیەکی کریستاڵی تایبەتی نییە. |
| ***Amphibia*** | وشکاوەکییەکان: ئەو گیاندارە بڕبڕەدارانەن کە ڕەوشتیان لە نێوان ماسی و خشۆکەکاندایە. |
| ***Amplitude*** | فراوانی |
| ***Amygdaloidal*** | لوزی، بادەمی |
| ***Anaerobia*** | بێهەواییەکان: ئەو زیندەوەرانەن کە دەتوانن بژین بەبێبوونی ئۆکسجینی سەربەست. |
| ***Analyser,analyzer*** | شیکەرە: بەشێکە لە وردبینی جەمسەرگر کە ڕووناکی جەمسەرگیراو وەردەگرێ و ڕەوشتەکانی پیشان دەدات. |
| ***Analysis*** | شیکاری |
| ***Anamorphism*** | پێکهێنەرە گۆڕان، گۆڕانی دروستکەر (بنیاتنەر) |

Anax/Apha

| | |
|---|---|
| *Anaxial* | ناتەوەرەیی |
| *Ancient* | کۆن |
| *Anemometer* | با پێوەر (پێوەری خێرایی با) |
| *Angular* | گۆشەیی |
| *Angular unconformity* | نایەککەوتنی گۆشەیی |
| *Anhedral* | بێڕوو |
| *Anhydrite* | گۆگرداتی کالسیۆمی نا ئاوی |
| *Anhydrous* | نا ئاوی |
| *Anisotropic* | تایبەخۆ جیاوازەکان: سیفەتی گۆڕانی ڕەوشتە فیزیاییەکان بە گۆڕانی ئاڕاستە. ئەم سیفەتە لە هەموو مادە کریستاڵیەکاندا هەیە جگە لەوانەی کە لەسەر ڕژێمی شەشپاڵوودەبن بە بلوور. دژی وشەی isotropic دێت. |
| *Annelida* | ئەڵقەدارەکان: کۆمەڵێ گیانداری بێبڕبڕەن، لەشیان پێکهاتووە لە چەند پارچەیەك، بەشێوەیەکی گشتی بە کرمەکان دەناسرێن. |
| *Anode* | جەمسەری موجەب (جەمسەری ئەنۆد) |
| *Anomalous* | ناوازە: لە سیفەتەکانیدا جیاوازە لە چواردەورەکەی، یان لایداوە لە باری ئاسایی. |
| *Anomaly* | ناوازەیی: لادان لە باری ئاسایی. |
| *Antarctica* | هەرێمی جەمسەری باشوور |
| *Antennae* | هەستەوەرەکان |
| *Anterior* | بەشی پێشەوە |
| *Antetheca* | دوابەربەست |
| *Anthozoa* | هەناوە ریخۆڵەییەکان |
| *Anticline* | چینە چەماوە کووڕەکان: بریتییە لەو چینانەی کە بۆ سەرەوە چەماونەتەوەو هەردوولاکانی چەمانەوە لەتەوەرە دوور دەکەونەوە |
| *Anticlinorium* | چینە چەماوەی کووڕی |
| *Antipedes* | بەرامبەرەکان |
| *Antiform* | گومەزیی (قۆقز) |
| *Antithetic faults* | دژە لێکترازاوەکان |
| *Aperture* | کون ، بۆشایی بۆ ناو تەن |
| *Apex* | سەر ، لوتکە ، ترۆپك |
| *Apex of fold* | لوتکەی نوشتاوە |
| *Aphanitic texture* | وردە تنراو: زاراوەیەکە بەو کەڤرانە دەوترێت کە دەنکۆڵەکانیان هێندە وردە ناتوانرێت بەچاوی ئاسایی ببینرێت. |

| | |
|---|---|
| ***Aphotic*** | تاریك |
| ***Apical angle*** | لوتکە گۆشە |
| ***Apogee*** | دوورترین خاڵی زەوی لە خۆرەوە، کاتێك کە زەوی لە دوورترین خاڵدا دەبێت لە خۆرەوە 94.450.000میل. |
| ***Apophyses*** | چوکڵە: لقێك لە دەمارێکی ئاگرین کە پێوەی نووسابێت. |
| ***Apparent*** | رواڵەت |
| ***Apparent dip*** | لارەڕووکار، لاری رواڵەت: پلەی لاری چینەکان بەو ئاراستەیەی کە ئەستون نەبێت لەسەر ئاراستەی لێدەر. |
| ***Appendages*** | پێبەندەکان |
| ***Appendix*** | پاشکۆ |
| ***Applied*** | کردەیی، کارپێکراو |
| ***Aquatic (Aqueous)*** | ئاوەکی |
| ***Aqueduct*** | جۆگەی ئاو |
| ***Aquifer*** | ئاوە کۆگای ژێر زەوی (کۆگای ئاوی ژێر زەوی): ئەو جۆرە کەڤرانەیە کە بۆشایی تیادایەو توانای کۆکردنەوەی ئاوی هەیەو کەوتۆتە نێوان ئەو چینانەی کە نایەڵن ئاو تێپەڕ ببێت پیایاندا. |
| ***Aquifuge*** | راگرە چین ، چینی راگر |
| ***Arabian shield*** | قەڵغانی عەرەبی |
| ***Arachnida*** | جاڵجاڵۆکەییەکان |
| ***Aragonite*** | کاربۆناتی کالسیۆم، ئاراگۆنایت |
| ***Arc*** | کەوانە |
| ***Arch*** | تاق |
| ***Archoean era (Archeozoic)*** | دێرینی سەرەتایی: دیرۆی سەرەتای، لە دیراوڵی کرمانجی ژوورووەوە هاتووە). |
| ***Archeous*** | سەرەتا |
| ***Archdam*** | بەربەستی کەوانەیی |
| ***Arctic circle*** | جەمسەریی بازنەیی |
| ***Arcuate fold*** | کەوانە توێ |
| ***Area*** | رووبەر، ناوچە |
| ***Arenaceous*** | لمین: سیفەتێکی ئەو کەڤرانەیە کە لمیان تیادایە یان لە لمەوە دروست بوون. |
| ***Arenaceous rocks*** | کەڤرە لمییەکان |
| ***Argil*** | قوڕ |
| ***Argillaceous rocks*** | کەڤری قوڕین |
| ***Arial photography*** | وێنەی ئاسمانی |

*Arid/Asvm*

| | |
|---|---|
| ***Arid climate*** | ئاوو هەوای وشك: ئەو ئاووهەوایەی کە ڕێژەی باران بارین بەشی ڕووەکەکان ناکات، ڕادەی باران بارین لە 10ئینج کەمترە. |
| ***Arm*** | قۆڵ ، باسك |
| ***Arrangement*** | ڕێکخستن |
| ***Arsenic*** | زەرنیخ |
| ***Artesian*** | ئیرتیوازی: ئاوی ژێر زەوی کە لە ژێر پاڵەپەستۆیەکی زۆردایە کە بەرزی دەکاتەوە بۆ سەروو ئاستەکەی کەتیایدایە لەکاتی لێدانی بیردا، لەوانەیە نەتوانێت بەرزی بکاتەوە بۆ سەر ڕووی زەوی. |
| ***Arthropoda*** | جومگەدارەکان، پێجومگەییەکان: پۆلێکن لە گیاندارە بێبڕبڕەکان کە قاچیان جومگە جومگەیە. |
| ***Articulata*** | پێبازووە بەیەکانووساوەکان |
| ***Asbestos*** | ئەزبێز: خاوێکی گروپی ئەمفیبۆلایتە، ڕیشاڵیەو ڕەنگی لە نێوان سپی و خۆڵەمێشیو سەوز دایە و ناسوتێت و بەکاردەهێنرێت لە پیشەسازیدا. |
| ***Asexual reproduction*** | ناتوخمە زۆربوون: ئەو زۆربوونەیە کە توخمە خانەکان تیایدا بەشدار نابن. |
| ***Ash*** | خۆڵەمێش: وردە بەردی گڕکانییە کە تیرەی دەنکۆڵەکانی لە 4 ملم زیاتر نییە. |
| ***Aspect*** | ڕووکار، ڕوو |
| ***Asphalt*** | قیر، ئەسفەلت: مادەیەکی ڕەق یان نیمچە ڕەقی بیتیومینی ڕەشی سروشتییە. |
| ***Assemblage*** | کۆکراوە، مەڵۆ |
| ***Assimilation*** | تواندنەوە: کرداری کارلێکردنی هەمووی یان بەشی ئەو مادە کەڤریانەی کە دەکەونە ناو ماگماوە لە چوار دەورەوە لەگەڵ ماگمادا. |
| ***Assumption*** | خەملاندن |
| ***Asteroidea*** | ئەستێرەی دەریا |
| ***Asteroids*** | هەسارۆکەکان |
| ***Asthenosphere*** | ئەستینۆسفێر:توێژێکە لە توێژەکانی زەوی کە دەکەوێتە ژێر قولایی دەیەها کیلۆمەترەوە و کەڤرەکانی بەوە دەناسرێن کە پلاستیکێن یارمەتی هاوسەنگی جولاندنەکانی توێکلی زەوی دەدەن. |
| ***Astronomical geology*** | جیۆلۆجیای گەردوون |
| ***Asymmetry*** | ناهارتایی ،ناچوونیەکی |

Atel/Azoi

| | |
|---|---|
| *Atelostmes* | بێشەویلگەکان |
| *Atlantic ocean* | ئۆقیانووسی ئەتڵەسی |
| *Atmosphere* | ئەتمۆسفیر، بەرگە هەوا: ئەوبەرگە هەوایەی کە دەوری زەوی داوە. |
| *Atolls* | مۆڵگە بازنەییە شیلانییەکان |
| *Atom* | گەردیلە |
| *Atomic bonds* | بەندە گەردیلەیی |
| *Atremata* | بێکونەکان |
| *Atenuation* | پوکانەوە، کەمبوونەوە |
| *Attitude of bed* | ئاراستەی چین، ڕووگەی چین |
| *Attraction* | کێشکردن |
| *Augite* | ئۆگایت:خاوێکی کۆمەڵەی پایرۆکسینە. |
| *Aureole* | هالە، خەرمانە: ئەو ناوچەیەیە کە دەوری لەشێکی ئاگرینیداوە و گۆڕانی پێوە دیارە. |
| *Austral* | باشوری |
| *Authigenic* | لەشوێن خۆ دروست بوو: کەڤرێك لەو شوێنەی لێیەتی هەر لەوێ دروست بووە. |
| *Autoclastic* | لەشوێن خۆ ورد بوو: بەو کەڤرانە دەوترێت کە ورد بوون لە هەمان شوێنی دروست بوونیاندا. |
| *Autochthonous* | خۆجێییەکان ، نەگوێزراوەکان |
| *Automorphic* | خۆیی |
| *Autotheca* | بەرگە بنچینە، بنچینە بەرگ |
| *Auxilliary* | یاریدەدەر |
| *Avalanche* | شا تۆپەڵ: کەوتنە خوارەوەی تۆپەڵە بەفرینەکان و هەموو مادە کەڤریەکانی کە هەڵیگرتووە لەسەر شاخێکەوە. |
| *Avis* | باڵندەکان |
| *Axial ring* | زنجیرەی تەوەرەیی |
| *Axis* | تەوەرە |
| *Axis of symmetry* | تەوەرەی هاوتایی |
| *Azimuth* | لوتکە گۆشە، گۆشەی تەوقە سەر |
| *Azoic era* | چاخی بێژیان: تەمەنی جیۆلۆجی لە پێش چاخی کامبرییەوە کە کەڤرەکانی بەتەواوی خاڵین لە ژیانی کۆن یان شوێنەواری کۆن. |

# -Bb-

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| *Back flow* | داکشان |
| *Back reef* | پشتی مۆڵگە |
| *Back water* | ئاوی وەستاو |
| *Baculites* | پێسەرییەکان (پێسەری) |
| *Bahada* | پێدەشت |
| *Baiter* | زمانەی هەڵکەندن |
| *Balance* | تەرازوو |
| *Ball clay* | تۆپە قوڕ:جۆرێکە لە کانۆلین دەنکۆڵەکانی بەشێوەی شەشپاڵووە، ڕێژەیەکی زۆر لە خلتەی تێدایە. |
| *Ball and pillow structure* | گۆو سەرینە پێکهاتوو |
| *Banded* | ریز کراو |
| *Banded coal* | خەڵوزی ناچوون یەك |
| *Bank* | ڕۆخ، کەنار |
| *Bar* | بەربەست |
| *Barometer* | پەستانپێو |
| *Barrel* | بەرمیل |
| *Barren* | رووتەن |
| *Barrier* | بەربەست |
| *Basal cleavage* | کەرت بوونی بنچینەیی |
| *Basal conglomerate* | چەوی بنکەیی |
| *Basal pinacoid* | بنکە روو (رووی بنکەیی) |
| *Base* | بنکە |
| *Base level* | ئاستی بنکە |
| *Base line* | هێڵی بنچینەیی |
| *Basement rocks* | کەڤری بنچینەیی: پێکهاتوویەکی ئاڵۆزی کەڤرە ئاگری و گۆڕاوەکانە چینی کەڤرە نیشتووەکان لەسەریان دەنیشێنن بە نایەککەوتوی. |
| *Basic* | بنکەیی، تفتەکان |
| *Basin* | ئاوزێڵ |
| *Bathometer* | قووڵاییپێو: پێوەری قووڵایی دەریاکان |

Bath/Bino

| | |
|---|---|
| *Bathyal* | قوولایی نێوان 200–2000م لە دەریاکاندا. |
| *Bathymetry* | پێوانی قوولایی |
| *Bay* | کەنداو |
| *Bc –joint (longitudinal joint)* | درێژە نێوانە روو:بەو نێوانە روانە دەوترێت کە تەریبن بە تەوەرەی چینە چەماوەی کەڤرە نیشتووەکان. |
| *Beach* | رۆخ ، کەنار ، لێوار |
| *Beak* | دەنوك:پێکهاتوویەکی شێوە دەنوکی لە پێشەوەی لەپکەی نەرمۆڵە دوولەپکەییەکاندا، بەهەمان مانای Umbo دێت. |
| *Bearing* | ئاراستە: ئاراستەی هێڵێك بەگوێرەی باکوری جوگرافییەوە یان لادانی هێڵێك لەباکوری جوگرافییەوە. |
| *Bed* | چین |
| *Bedding* | چینە ریزبووەکان (چین بوو) |
| *Bedding plane* | ئاستی چینەکان |
| *Bed load* | بنەقورسایی |
| *Bed rock* | کەڤری دانەماڵراو: بەو کەڤرە دەوترێت کە لە ژێر خۆڵەوەیەو داماڵین کاری تێنەکردوە. |
| *Behavior* | رەوشت، رێباز |
| *Behavior stream* | رووباری بڕاو (بەهۆی بەربەستێکەوە) |
| *Beheading of river* | رووباری دیل |
| *Belemnite* | گوللەییەکان : بەشێکن لە پێسەرییەکان. |
| *Belt* | پشتێن |
| *Benioff fault plane* | لێکترازاوی رووی بینۆف |
| *Benthonic* | بن ئاو کەوتو: ئەو گیاندارانەن کەلەبنی دەریاکاندا دەژین بەشێوەیەکی جێگیر یان جولاو. |
| *Benthous* | بنئاو کەوتوەکان |
| *Bentonite* | گلەسەر:جۆرێکە لەگلی مۆنتمۆرلۆنایت کە بەکاردێت لەکاری هەڵکەندنی بیری نەوتدا بەهۆی رەوشتی رووە مژینەوە. |
| *Benzene* | بەنزین $C_6H_6$: یەکێکەلەبەرهەمەکانی نەوت. |
| *Beta particle* | دەنکۆڵەی بێتا |
| *Biaxial* | دوو تەوەرەیی (جووت تەوەرەی) |
| *Biconvex* | دوو روو قۆقز (جووت روو قۆقز) |
| *Bilateral symmetry* | تەنیشتە هاوتایی |
| *Bimodal* | دوو جەمسەر |
| *Binomial nomenclature* | ناونانی دووانی: یاسای ناونانی بونەوەران کەلە دوو وشە پێکدێت یەکەمیان بۆ رەگەزەکەو دووەمیان بۆ جۆرەکەی. |

Bioc/Blow

| | |
|---|---|
| ***Bioclastic*** | وردبوی بوونەوەر |
| ***Bioclastic rock*** | بەردی میکانیکی، (کەڤری وردبوی بوونەوەری): بەو کەڤرە دەوترێت کە پێکهاتووە لە لەپکەو پەیکەری زیندەوەرە کۆنەکان. |
| ***Biocenoasis*** | پێکەوە ژیاو: کۆمەڵە زیندەوەرانێکە کە پێکەوە دەژین و یەکەیەکی ژینگەی سروشتی پێك دەهێنن، ئەم جۆرە کۆمەڵانە بە گشتی دەلالەت لە بارودۆخی هێمنی نیشتن دەکەن.. |
| ***Biofocies*** | زیندە شێواز :بەو چینانە دەوترێت کە لە چینەکانی سەرو خوارەوەی جیا دەکرێتەوە بەهۆی ئەو بەردبوانەی تیایدایەتی. |
| ***Biogenic*** | دروست بوون بەهۆی زیندەوەرەوە |
| ***Biogeography*** | جوگرافیای زیندەوەران |
| ***Bioherms*** | مۆڵگەی شیلانی |
| ***Biolith*** | زیندە کەڤر |
| ***Biosphere*** | زیندەگییە بەرگ، بەرگی زیندەگی |
| ***Biostratigraphy*** | چینزانی زیندەگی: لێکۆڵینەوەی چینەکان لە رووی بڵاوبونەوەی ئاسۆیی و ستونی ئەو بەبەردبوانەی تیایدایە. |
| ***Biostromes*** | مۆڵگەیی شیلانی چیندار |
| ***Biota*** | زیندەوەران |
| ***Biotite*** | مایکای رەش: یەکێکە لە خاوەکانی مایکا و رەنگێکی رەشی هەیە. |
| ***Bioturbation*** | زیندە تێکدان ، تێکدانە زیندەیی |
| ***Bipyramid*** | قوچکەی دووانی (جووت قوچەکی) |
| ***Biramous*** | دووپەل |
| ***Biserial*** | دوو زنجیرە |
| ***Bit*** | پارچە |
| ***Bitheca*** | بەرگی دووەم |
| ***Bitumen*** | قیر ، بیتیومین |
| ***Bivalve*** | دوولەپکەییەکان |
| ***Black diamond (Coal)*** | خەڵوز |
| ***Blending*** | تێکەڵکردن |
| ***Blind*** | شاراوەو نادیار |
| ***Blind valley*** | کوێرە دۆل (دۆڵی براو) |
| ***Blisters*** | دەرەنوکەکان |
| ***Block*** | بەربەست ، بلۆك |
| ***Blown sand (Aeolian sand)*** | لمی بایی |

| | |
|---|---|
| *Body chamber* | ژووری لەش |
| *Body wave* | شەپۆلە لەشییەکان ، شەپۆلە تەنییەکان |
| *Bog* | زەلکاو |
| *Boil* | کولان |
| *Border* | لێوار |
| *Borehole* | بیر |
| *Boring (borrow)* | چاڵ ، کون |
| *Boring rod* | ستوونی هەڵکەندن |
| *Borrow* | هەڵکەنراو |
| *Botryoidal* | هێشوویی: بەکاردێت بۆ وەسفکردنی ئەو خاوانەی کە بە شێوەی هێشووین. |
| *Bottom* | بن ، بنکە |
| *Bouger anomaly* | ناوازەیی بوجیر |
| *Boulder* | خڕکە بەرد: تیرەکەی لە 256 ملم زیاترە. |
| *Boundary* | سنور |
| *Bow* | کەوان |
| *Bowen's reaction series* | زنجیرە کارلێکی باون |
| *Box fold* | نوشتاوەی سندوقی |
| *Brachiopoda* | پێبازوییەکان: پۆلێکن لە گیاندارە دەریاییە بێبڕبڕەکان پەیکەرەکەیان لە دوو دەروازە پێکدێت کەنایەکسانن و هەریەکەیان تەنیشتە هاوڕێکە.لەپکەکانیان یان کلسی یان کایتینیە.درێژیان لە 5 ملم بۆ 20 سم.لە کامبرییەوە تائێستا بەردەوامن لە ژیاندا. |
| *Bracky axis* | تەوەرەی کورت |
| *Brackish* | سوێر: تێکەڵەیەکە لە ئاوی پاك و سوێراو. |
| *Brackish water* | سوێراو |
| *Bragg angle (reflection angle)* | گۆشەی براگ ($\theta$) |
| *Braiding river* | ڕووباری فرە ڕێبازگە |
| *Bragg equation* | هاوکێشەی براگ $n\lambda=2dSin\theta$ |
| *Branchia* | کەوانەی ریشودار |
| *Breakable* | شکستەنی |
| *Breccia* | برێشیا: جۆرێکە لە کەڤرە وردبووەکان کە لێواری دەنکۆڵەکانی تیژن و تیرەکەیان لە 2ملم زیاترە. |

*Bree/Butt*

| | |
|---|---|
| ***Breeze*** | شنه |
| ***Bright*** | بریقەدار ، رووناك |
| ***Brilliant*** | درەوشاوە |
| ***Brittle*** | تورتی:سیفەتێکە بۆ شتێك کە زوو دەشکێت یان ورد دەبێت . |
| ***Britteness*** | زوو دەشکێت |
| ***Brocken fold*** | نوشتاوە شکاوەکان |
| ***Bromoform*** | برۆمۆفۆرم: سیانە برۆمیدی میثان $CHBr_3$ |
| ***Brook*** | جۆگەلە ، چەم |
| ***Broto crystal*** | بلووری داخوراو |
| ***Brunton compass*** | رووگە نمای برۆنتن:جۆرێکە لە رووگە نمای زەویناسی. |
| ***Bryozoa*** | چوزەوارەییەکان: پۆلێکە لە گیاندارە بێبڕبڕەکان بەشێوەی مۆلگە دەژین. |
| ***Bubble*** | بلقی هەوا |
| ***Budding*** | گۆپکە کردن |
| ***Bulge*** | هەلأوسان |
| ***Bulk density (apparent density)*** | چڕی رواڵەتی |
| ***Buoyancy*** | کەوتنە سەر :هەرشتێکی سوکتر دەگرێتەوە کە بکەوێتە سەر شتێکی لەخۆی قورستر، وەك تەختە دەکەوێتە سەر ئاو. |
| ***Burden*** | قورسایی |
| ***Burial*** | ناشتن |
| ***Burr*** | کەڤری پتەو |
| ***Butane*** | گازی بیوتان $C_4H_{10}$ |
| ***Buttress dam*** | بەربەستی راگیراو |

# -Cc-

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| *Cable – tool drilling* | هەلکەندن بە لێدان |
| *Cainozoic – era (Cenozoic era)* | چاخی ژیانی نوێ ،چاخی ژینۆ (بڕوانە Cenozoic) |
| *Calcarea & calcispongia* | ئیسفنجییە کلسییەکان ، هەرریە کلسییەکان |
| *Calcareous* | قسلی ، کلسی |
| *Calicferous* | بە قسل بوو |
| *Calcification* | ئەبێت بە قسل |
| *Caldera* | دەمی گڕکانی: چاڵێکی پانی سەر رووی زەوییە کە بریتییە لە دەمی گڕکانێکی مات. |
| *Calibration* | راستکردنەوە |
| *Caliche,Calcrete* | توێکلی قسلی ، توێکلی کلسی |
| *Calyx* | کڵاوە |
| *Cambrian peroid* | چاخی کامبری: یەکەم چاخ (لە دێرینی ژیانی کۆن) |
| *Camphi cocleous* | دوو روو چاڵ |
| *Canada balsam* | بەلسەمی کەنەدا:مادەیەکی کەتیرەیی چەسپکەرە: |
| *Canadel coal* | خەڵوزی مۆمی |
| *Cangon* | خەلەند: دۆڵێکی قووڵ کەلاکانی زۆر لێژن لە ئەنجامی داماڵین بەهۆی رووبارەوە دروست بووە. |
| *Cap* | سەرپۆش ، کڵاو |
| *Capacity* | فراوانی |
| *Cape* | سەر: بەشێک لە وشکانییە کە درێژبۆتەوە بۆ ناو دەریا. |
| *Capillary* | مووین |
| *Capillary tube* | بۆری مووین |
| *Cap rock* | کەڤری سەرپۆش |
| *Carbonaceous* | خەڵوزی |
| *Carbonization* | بوون بە خەڵوز: گۆڕانی مادەی ئەندامی بۆ خەڵوز کە یەکێکە لە رێگاکانی دروست بوونی بەبەردبووەکان. |
| *Cardinal* | بنچینەیی ، سەرەکی |
| *Cardinal septum* | بەربەستی سەرەکی |
| *Carnivorous* | گۆشتخۆر |

| | |
|---|---|
| *Cartography* | زانستی نەخشەکێشان |
| *Cascade* | تــاڤگـــە |
| *Casing pipe* | بۆری ناوپۆشکەر |
| *Caspian sea* | دەریای خەزەر ، دەریای قەزوین |
| *Cast* | داڕێژگە: بەو بۆشاییە دەوترێت کەلە ئەنجامی نەمانی پەیکەری بەبـەردبووەوە دروسـت دەبێـت و هەنـدێك جـار ئـەم بۆشـاییە بەنیشتوەکان پڕدەبێتەوە. |
| *Cast iron* | ئاسنی داڕشتە |
| *Cataclastic* | وردکەری |
| *Cataclastic theory* | تیۆری وێران بوون |
| *Catastrophe* | ڕووداوی ترسناك ، وێران بوون |
| *Caudal spine* | کلکە دڕك |
| *Catagensis* | قووڵـە کـردار:گـۆڕانی ئـەو تـازە نیشـتووانەی کـە چـینەکان دایانپۆشیوەو دەناسرێت بە بوونی پلەیەکی گەرماو پاڵەپەستۆی جیاواز لەوەی کە لە کاتی نیشتندا هەیە. بەهەمان مانای وشەی Katagensis دێت. |
| *Cave* | ئەشکەوت: بۆشاییەکەلەناو کەڤرەکاندا ،بەهۆی کرداری تواندنەوەوە دروست دەبێت. |
| *Caved* | ڕوخاو ، ڕماو |
| *Cease* | وەستان |
| *Cement* | چـیمەنتۆ: مادەیــەکی کلســی،ســلیکی،ئاســنی،..هتــد کــە دەنکۆڵـەکانی کـەڤرەکان پێکـەوە دەبەسـتێت یـان مادەیەکـە بەکاردێت بۆ کاری بیناسازی. |
| *Cementation* | لکاندن |
| *Cenozoic era* | چاخی ژیانی نوێ: دوایین چاخەکانی ژیـان ماوەکەی نزیکەی 170 ملیـون سـاڵە و دەناسـرێت بـە زاڵ بـوونی شـیردەرەکان و دەرکەوتنی مرۆڤ لە کۆتاییەکەیدا. |
| *Centrospher* | کرۆکــی زەوی: بــەو پارچــەیەی کرۆکــی زەوی دەوترێــت کــە دەکەوێتـە ژێـر بـەرگی کەڤرینـەوە لـە قووڵایی 2900کم لەسـەر زەوییەوە. |
| *Centre of symmetry* | چەقی هارتایی |
| *Centripetal* | کێشکەر |
| *Cephalone* | سەر |
| *Cephalopoda* | پێ سەرییەکان: کۆمەڵێك لە نەرمۆڵەکانە کە لە دەریادا دەژین و دەناسرێت بە هەبونی چەند قاچێك لە دەوری دەمیدا. |
| *Cephalo thorax* | سنگە سەر: پێکەوە لکانی سەرو سنگ لە هەندێك لـە پۆلـەکانی پێجومگەییەکاندا. |

Chai/Clin

| | |
|---|---|
| Chain | زنجیرە |
| Chalcedony | چالسیدۆنی: خاوێکە پێکهاتووە لە بلووری زۆر ورد لە کوارتز، وبەشێوەی ریشاڵی یان تیشکییە. |
| Chalk | تەباشیر: جۆرێکە لە بەردی کلس کە بەشێوەیەکی سەرەکی لە پەیکەری بەردبووە کلسییە وردبینییەکان پێکهاتووە. رەنگەکەی سپییەو نەرمە. |
| Chamber | ژوور |
| Chamberlete | ژوورۆچکە |
| Change | گۆڕان |
| Channal | نۆکەند |
| Char coal | خەڵوزی رووەکی |
| Chart | نەخشە ، هێڵکاری |
| Chert | بەردە ئەستێ: بریتییە لە کەڤرێکی نیشتووی رەق، چڕییەکەی زۆرە کریستاڵەکانی زۆر وردە و لە سلیکا پێکهاتووە (بەشێوەیەکی سەرەکی چالسیدونی). |
| Cheveron fold | نوشتاوەی زیگزاگی |
| China clay | قوڕی چینی،بڕوانە Kaolin |
| Chloro phyta | قەوزە سەرزەکان |
| Chondrites | بەردە ئەستێرە |
| Chronology | رۆژ ژمێری کاتی |
| Chronometer | کات پێو |
| Cinder | خۆڵە مێش |
| Cirripeda | پێکوڵکیەکان |
| Class | پۆل |
| Classification | پۆلێنکردن |
| Clastic | وردبوویی |
| Clay | قوڕ: تیرەی دەنکۆڵەکانی کەمترە لە 0.05ملم و پێکهاتووە لە سلیکاتی ئەلەمنیۆمی ئاوی. |
| Cleavage | شەقبردن |
| Cliff | بەرزایی |
| Climotology | زانستی ئاووهەوا |
| Climax | لوتکە |
| Clinometer | لاریپێو: ئامێرێکە بۆ پێوانی لاری چینەکان لە ئاستی ئاسۆییەوە بەکاردێت.زۆر جار لەناو رووگە نمادا هەیە. |

| | |
|---|---|
| *Closure* | داخستن |
| *Cloud* | هەور |
| *Cluster* | هێشوو ، تۆپەڵ |
| *Coagulation* | مەیین |
| *Coal* | خەڵوز |
| *Coast* | کەنار |
| *Cobble* | چەو :تیرەکەی 64 – 256ملم |
| *Coefficient* | هاوکۆلکە |
| *Coelentrata* | هەناوە ڕیخۆڵەییەکان: پۆلێکن لە گیاندارە بێبڕبڕەکان کەبەشێوەیەکی تاك یان کۆمەڵ (مۆڵگە) دەژین. |
| *Cohesion* | هێزی یەکگرتن ، یەکگری |
| *Coiled* | پێچ خواردوو |
| *Collapse* | ڕوخان ، داڕمان |
| *Colony* | مۆڵگە: کۆمەڵێك لە گیانداری چوون یەك کە پێکەوە دەژین لە شوێنێکدا. |
| *Colloidal* | ملی |
| *Columella, Column* | ستوون |
| *Collision* | بەیەکاکەوتن |
| *Comet* | کلکدار |
| *Compaction* | پەستاوتن |
| *Compass* | ڕووگە نما: بریتییە لە ئامێری دیاریکردنی ئاراستە لەگەڵ باکوری موگناتیسیدا، بەکاردێت لەکاری کێڵگەییدا. |
| *Competent* | پتەو |
| *Complex* | ئاڵۆز |
| *Compound* | ئاوێتە |
| *Compressible* | پەستەنی،پەستۆك |
| *Compression* | پەستان |
| *Compressinal waves* | درێژەشەپۆلەکان: جۆرێکە لەشەپۆلی بوومەلەرزەیی. |
| *Compressor* | چەسپکەر |
| *Computer* | ژمێرەر |
| *Conchoidal* | لەشێوەی گوێچکە ماسیدا. |
| *Concordance* | یەککەوتن |
| *Concordant* | یەککەوتوو |
| *Concentration* | خەستی ، پەتی |
| *Concretion,Nodule* | بەردە گرێ:کۆبونەوەی مادەی بەردێکی دیاریکراو لەناو بەردێکی تردا،کەشێوەی خڕ یان درێژکۆلەی هەیە. |

Cond/Cont

| | |
|---|---|
| *Condensation* | چڕبوونەوە |
| *Conduction* | گەیاندن |
| *Cone* | قوچەك |
| *Configuration* | شێوە ، نیگار |
| *Conformable* | یەککەوتو: نیشتنی چینەکان یەك لەسەر یەك بەشێوەیەکی ڕێك و تەریب و بەبێ پچڕان یان وەستان لە نیشتندا. |
| *Conformity* | یەککەوتن |
| *Conglomerate* | چەو: کەڤرێکی نیشتووییە کە دەنکۆڵەکانی تیرەیان لە 2ملم زیاترە و لێوارەکانیان خڕەو بە مادەی جیاواز پێکەوە بەستراون. |
| *Conferous* | سنەوبەری |
| *Conjugation* | گونجاندن |
| *Connate water* | ئاوی قەتیس (ئاوی کۆن): ئاوی سوێری هەڵگیراو لەناو کەڤرەکاندا. |
| *Conodont* | پێکهاتوی فۆسفاتی شێوە ددان |
| *Conrad discontinuity* | نابەردەوامی کۆنراد: ئەو نابەردەوامیەیە کە بەهۆی گۆڕانی خێرای شەپۆلە بوومەلەرزەییەکانەوە هەستی پێکراوەو دەکەوێتە نێوان بەرگەکانی سیماو سیال. |
| *Consolidation* | ڕەقبوون |
| *Constituent* | پێکهێنەر |
| *Construction* | دروستکردن |
| *Consumption* | کارکردن |
| *Contact* | ڕووی بەیەکگەیشتن: ئەو ڕووەیە کەلە نێوان دوو جۆری جیاواز لە کەڤرەکان یان دووتەمەنی جیاوازدا هەیە. |
| *Contamination* | پیس بوون |
| *Contemporaneous* | هاوکات |
| *Content* | ناوەخن |
| *Continent* | کیشوەر |
| *Continental slope* | لێژی کیشوەری |
| *Continental drift* | ڕامالینی کیشوەرەکان: ڕاکێشانی کیشوەرەکان لەسەر ڕووی زەوی بەهۆی بەن هێزی لە توێکڵی زەوی لە قولایی ئۆقیانووسەکاندا. |
| *Continuation* | بەردەوامی |
| *Contortion* | چەمانەوە |
| *Contour line* | هێڵی کەنتۆری: بریتییە لەو هێڵەی کە هەموو خاڵەکانی سەر ڕووی یەك بەرزیان هەیە لەڕووی دەریاوە و بەکاردێت بۆ دیاریکردنی بەرزایی و نزمایی لەسەر نەخشە تۆپۆگرافییەکان. |

Cont/Coun

| | |
|---|---|
| *Contour map* | نەخشەی کەنتۆری |
| *Contraction* | هاتنەوەیەك |
| *Contrast* | جیاوازی |
| *Convection currents* | تەوژمی بارهەڵگر: گوێزانەوەی مادەی بەرهەم هاتوو بە هۆی جیاوازی چڕی لە ناوەندە زۆر گەرمەکاندا، بڕوا وایە کە ئەم تەوژمانە بەرهەم دێن لە ئەنجامی گوێزانەوەی گەرمی لە بنی توێکڵی زەویدا بۆ سەر زەوی و دەبێتە هۆی ئەو جوڵانەی کە شاخەکان دروست دەکات. |
| *Convergent* | نزیك بەیەك |
| *Convolute bedding* | چین بووی پێچاوپێچ |
| *Coordinates* | تان وپۆ (تەوەرەکان) |
| *Coordination* | ڕێکخستن |
| *Copper* | مس(Cu): کانزایەکی ڕەنگ سورە توانای لێدان و ڕاکێشانی هەیە. |
| *Coquina* | بەردە سەدەف |
| *Coral* | شیلان |
| *Coral reef* | مۆڵگەی شیلانی |
| *Core* | کرۆك، ناوك: نموونەیەکی لوولەییە لە کەڤرەکان بەهۆی هەڵکەندنەوە دەردەهێنرێت. |
| *Core of the earth* | کرۆکی زەوی: بەشی ناوەوەی گۆی زەوی کە دەکەوێتە ژێر قووڵایی 2900کم لەسەر ڕووی زەوییەوە و پێکهاتووە لە ئاسن و نیکل. |
| *Corrosion* | هەڵکۆڵینی سروشتی |
| *Correlation* | پێکەوە بەستن: کرداری بەراوردکردنی چینەکان لە ڕووی پێکهاتنی کەڤری و بەبەردبوونییەوە لەناوچە جیاوازەکاندا. ئامانجەکەی دیاریکردنی پەیوەندییە کاتیو نیشتووییەکانە لە نێوان ئەو چینانەدا. |
| *Corrosion* | هەڵکۆڵینی کیمیایی |
| *Corundum* | یاقووت (کورندم): خاوێکەکە پێکهاتووە لە ئۆکسیدی ئەلەمنیوم ($Al_2O_3$) لە ڕووی ڕەقێتییەوە لە دوای ئەڵماس دێت، ڕەنگەکەی شین یان سوورە. |
| *Cosmology* | گەردوونزانی ، زانستی گەردوون |
| *Costa* | لا ، ڕوو |
| *Costate* | چەند لا |
| *Counter* | پێچەوانە |

Coup/Cryp

| | |
|---|---|
| *Couple* | جووت |
| *Course* | ڕێباز |
| *Coverage* | داپۆشین |
| *(C.P.I) Carbon preference index* | ویستە هاوکۆلکەی کاربۆن |
| *Crab* | قرژاڵ |
| *Crack* | شەقبوون |
| *Crater* | دەم: زاراوەیەکە بە گشتی بەکاردێت بۆ دەمی گڕکان. |
| *Cratons* | جێگیرەکان: ناوچە جێگیرەکان لە توێکڵی زەوی کە بەشێکن لە کیشوەرە سەرەکییەکان، ئەم ناوچانە زیاتر جێگیرن لە ناوچەی ئۆقیانووسەکان. |
| *Creep* | ئەخشێت،خشان |
| *Crenellation* | لۆچ |
| *Crest* | لوتکە: بەرزترین خاڵ لە چینە چەمارەکووڕەکاندا. |
| *Crest line* | هێڵی لوتکە |
| *Cretaceous period* | ماوەی تەباشیری: سێیەم و دوایەمین ماوەی چاخی ژیانی ناوەڕاستە. |
| *Crevasse* | دابڕاوی سەهۆڵی |
| *Crinoids* | شێوەگوڵی،تاجگوڵینەکان: پۆلێکە لە پێست دڕکاوییەکان کە بەهۆی قەدێکەوە جێگیرە و لە ماوەی ئۆردۆڤیشییەوە هەیە تا ئێستا. |
| *Critical* | شلۆق |
| *Critical angle* | گۆشەی شلۆق |
| *Cross bedding* | چین بووی بڕاو |
| *Crossing* | یەکتربڕین |
| *Cross section* | پانە بڕگە |
| *Crude oil* | نەوتی خاو |
| *Crumbling* | وردەبوون |
| *Crush* | هاڕین، وردکردن |
| *Crust* | توێکڵ |
| *Crust of the earth* | توێکڵی زەوی: بەو بەشەی دەرەوەی زەوی دەڵێن کە دەکەوێتە سەروو نابەردەوامی مۆهۆوە. |
| *Crustacean* | توێکڵدارەکان : بەشێکە لە پێجومگەییەکان. |
| *Cryptocrystalline* | وردەبلوور: بە تنراوی ئەو کەڤرانە دەوترێت کە بلوورەکانی هێند بچوکە تەنانەت لەژێر وردبینی ئاسایدا جیاناکرێتەوە. |

Cryp/Cyst

| | |
|---|---|
| *Cryptozoic era* | دیرینی ژیانی نهێنی: دێرینی پێش چاخی کامبری. |
| *Crystal* | بلوور،کریستاڵ: بریتییە لە تەنێکی رەق، پێکهاتنێکی کیمیاوی و شێوەیەکی رێك و پێکی هەیەو دەناسرێت بە بوونی ریزبوونی گەردیلەی ناوەکی بەشێوەیەکی سروشتی دروست دەبێت لەژێر بارودۆخی گونجاوی پەستان و پلەی گەرماو چڕی مادە لە گیراوەکاندا. |
| *Crystal lattice* | تۆڕە بلوور |
| *Crystalline texture* | رەشتەی بلووری |
| *Crystallization* | بوون بە بلوور: بریتییە لە کرداری بوون بە کریستاڵ لە دۆخی گازی یان شلییەوە. |
| *Crystallography* | زانستی کریستاڵ ، بلوورزانی: ئەو زانستەیە کە دەکۆڵێتەوە لە شێوەی کریستاڵەکان و پۆلێنکردنیان. |
| *Cube* | شەشپاڵوو |
| *Cuesta* | کوێستا: بەو گردە یان بەرزییە دەوترێت کە لە لایەکییەوە لێژییەکەی کەمە (بە ئاراستەی لاری چینەکان) و لاکەی تری لێژییەکەی زۆرە. |
| *Cumilation* | کەڵەکە بووەکان |
| *Cumulative* | کەڵەکەبوو |
| *Current* | تەزوو یان تەوژم |
| *Curvature* | چەماوە بوون |
| *Curve fitting* | چەماوەی لەبار |
| *Cutting* | پارچەی براو |
| *Cyclic* | خوول |
| *Cyclic sedimentation* | نیشتنی خوول |
| *Cyclothem* | شێوە خوول |
| *Cylinder* | لوولەك |
| *Cyst* | کیس |
| *Cystitis* | کیسییەکان |

# -Da-

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| Dam | بەربەست |
| Damping | پوکانەوە |
| Darcy's law | یاسای دارسی |
| Data | داتا،دراوەکان |
| Datum plane | ئاستی سەرەکی |
| Debris | وردەبەرد: وردە بەردێ کە لە ئەنجامی شکان و وردبونی کەڤرەوە دروست دەبێت. |
| Decay | هەڵوەشان |
| Declination | لادان: ئـەو گۆشـەیەیە کـە دەکەوێتـە نێـوان ئاراسـتەی دەرزی موگناتیســی (بــاکوری موگناتیســی) و بــاکوری جــوگرافی و دەگۆڕێت بە گۆڕانی شوێنی جوگرافی. |
| Decollement | جیابوونەوە |
| Decomposition | شیبوونەوە: وردبونی کەڤرەکان بەهۆی کردارە کیمیاییەکانەوە کە لە ئەنجامی کەشاندنەوە دروست دەبێت. |
| Deduction | پۆدەرکەوتن |
| Deep | قووڵ |
| Deficiency | کەمی |
| Definition | پێناسە |
| Deflection | پێچـکردنەوە، لادان: گـۆڕانی کتـوپڕی (لـەناکاوی) ئاراسـتەی زنجیرە شاخێك. |
| Deformation | تێکدان ، شێوان |
| Degradation | رامالین ، داخوران |
| Dehydration | ئاو لێکردنەوە ، وشککردنەوە |
| Delineation | دیاریکردن |
| Delta | خاکلماو: خاکێکی شێوە سێگۆشەیە لە شوێنی بەیەکگەیشتنی ڕوبـار بـە دەریـاوە دروسـت دەبێـت و پێکهـاتوە لـە نیشـتووە قوڕییەکان و لمییەکان. |
| Demospongia | ئیسفنجییە درك وردەکان |
| Dendritic | شێوە درەختی |
| Density | چڕی |
| Denudation | رامالین |

Depo/Dias

| | |
|---|---|
| *Deposited* | نیشتوو |
| *Deposition* | نیشاندن ، توێگری |
| *Depression* | چاڵایی |
| *Depressuring* | دابەزینی پەستان |
| *Dermal layer* | چینی پێستی |
| *Derrick* | بورجی هەڵکەندن |
| *Desalting* | جیاکردنەوەی خوێیەکان |
| *Desert* | بیابان |
| *Desiccation* | شێمژین:ئاوەمژین لەشتێك بەهۆی ئاوەمژەوە. |
| *Destruction* | روخان ، رمان |
| *Detrital* | پارچە پارچەیی: ئەو کەڤرەیە کە پێکهاتوە لە پارچە پارچەی کەڤرەکانی تر. |
| *Deviation (diffraction)* | لادان |
| *Dextral* | راستڕەو: ئاراستەی جوڵەی یان پێچخواردنی بۆ لای راستە. |
| *Dextral fault* | لێکترازاوی راستڕەو: ئەو لێکترازاوەیە کە ئاراستەی جوڵە تیایدا بۆ لای راستە. |
| *Dextral fold* | نوشتاوەی راستڕەو |
| *Diachronous* | جیاوازی لە تەمەنی جیۆلۆجیدا |
| *Diaphragm* | بەربەست ، جیاکەرەوە |
| *Diagenesis* | گۆڕانە کردارەکان: بەو کردارە فیزیایی و کیمیاییانە دەوترێت کە نیشتووەکان تووشی دەبن پاش نیشتنیان و دەبێتە هۆی یەککگرتن و رەقی. |
| *Diagonal* | تیرەیی |
| *Diagram* | هێڵکاری |
| *Diamond* | بریلیان، ئەڵماس: خارێکە پێکهاتنی کیمیاییەکەی بریتییە لە کاربۆن کەلەسەر سیستەمی شەش پاڵو دەبێت بە کریستاڵ. دادەنرێت بە رەقترین خاو و یەکێکە لەبەردە بە نرخەکان. |
| *Diaper structure* | پێکهاتووی برەر |
| *Diastem* | دایەستم: دابڕانێکی کورت لە نیشتندا، لەوانەیە کشاندنی لەگەڵدا بێت یان نا. |
| *Diastrophism* | دایە سترۆفیزم: زاراوەیەکی گشتییە بەکاردێت بۆ هەموو ئەو جوڵانەی توێکڵی زەوی کە بە هۆی هێزەکانی زەوییەوە روودەدات. لەو جوڵانە دروست بوونی ئۆقیانووس وکیشوەر وزنجیرە چیاکان... هتد. لە بەشە سەرەکیەکانی ئۆرۆجینی و ئیپی ئۆرۆجینی. |

Diat/Disr

| | |
|---|---|
| ***Diatom*** | دایەتۆم: رووەکێکی یەك خانەی وردبینییە پەیکەرەکەی لە سلیکا پێکهاتووە. |
| ***Diductor muscle*** | ماسولکەی دوورخەرەوە |
| ***Differential*** | جیاکاری |
| ***Differentiation*** | جیابوونەوەی ماگما: جیا بوونەوە ی پێکها تووەکانی ناو ماگما بۆ دروست کردنی کەڤرە ئاگرییە جیاوازەکان. |
| ***Diffusion*** | بڵاوبوونەوە |
| ***Digging*** | پشکنین ، هەڵکەندن |
| ***Digital*** | ژمارەیی |
| ***Dike (Dyke)*** | بەربەستی ستوونی: ئارکێشێك لە کەڤری ئاگرین کە بەشێوەی دیوارێك دەبێت و کەڤرەکانی تر دەبڕێت . |
| ***Dilatation (Dilation)*** | کشان (شێوانی قەبارەیی) |
| ***Dilute*** | روون |
| ***Diluvium*** | نیشتووی لافاو |
| ***Dimension*** | دووری |
| ***Dimorphism*** | دوو شێوە |
| ***Dip*** | لاری: ئەو گۆشەیەیە کەچین دروستی دەکات لەگەڵ ئاسۆدا. |
| ***Dipmeter*** | لارپێو: ئامێرێکە بەکاردێت بۆ پێوانی لاری چینەکان. |
| ***Dipole*** | دووجەمسەر |
| ***Dip slope*** | لاری لێژی: لێژی ناوچەیەك یان رووبەك کەبەهەمان ئاراستەی لاری چینەکانی ژێرەوەیە. |
| ***Discharge*** | بەتاڵکردنەوە ، پاڵاوتن |
| ***Disconformity*** | نایەککەوتن: نایەککەوتن لەنێوان دوو کۆمەڵ چینی تەریب بەیەك کە لە ئەنجامی داخوران و داماڵینی رووی چینی ژێرەوە دروست دەبێت. |
| ***Discontinuity*** | نابەردەوامی: گۆڕانی لەپڕو خێرا لە رەوشتە فیزیاوییەکانی چینەکانی زەویدا. |
| ***Disharmonic*** | نا هاوڕێك |
| ***Disintegration*** | کەرت بوون یان وردبوون |
| ***Dislocation (displacement)*** | لەجێچوون: جوڵان و لەجێچوونی شوێنی کەڤرەکانی لاکانی لێکترازاو. |
| ***Dispelling*** | رەوینەوە |
| ***Disruption*** | شکان |

Diss/Dura

| | |
|---|---|
| ***Dissipation*** | ساردبوونەوە |
| ***Dissolution*** | توانەوە |
| ***Distillation*** | دلۆپاندن |
| ***Distortion*** | شێواندن |
| ***Distribution*** | دابەشکردن |
| ***Divergent*** | دوورکەوتنەوە ، دابڕان |
| ***Dolomitization*** | بوون بەدۆلۆمایت: کرداری جێگرتنەوەی کاربۆناتی کالسیوم لەلایەن کاربوناتی مەگنیسیۆمەوە لەبەردی کلسیدا. |
| ***Domain*** | بوار |
| ***Dome*** | گومەز: پێکماتوییەکە کە لاری چینەکان تیایدا بۆ دەرەوە دەبێت بەهەموو لاکاندا. |
| ***Downs*** | گردۆلکە |
| ***Down throw*** | بەشی خوارکەوتوو: بەشی داکەوتوو لە چینەکانی ئەم لاو ئەولای لێکترازاودا. |
| ***Drag*** | راکێشان: راکێشان و چەمانەوەی چینەکانی ئەم لاو ئەولای لێکترازاو. |
| ***Drag fold*** | نوشتاوەی راکێشراو: بریتییە لەو چینەچەماوە ناسەرەکیانەی لەلەچینە نەرمەکانی نێوان دوو چینی رەقدا دروست دەبێت. |
| ***Drainage*** | رەواندن |
| ***Drifted*** | داماڵراو، گوێزراو: گوێزانەوەی مەواد لە شوێنی بنچینەیی خۆیەوە بۆ شوێنێکی تر. |
| ***Drill*** | کونکەر |
| ***Drilling bit*** | ئامرازی کونکردن ، درەوشە ، سمەر |
| ***Drumlin*** | گۆمی سەهۆڵی: بریتییە لەو نیشتووییە سەهۆڵیانەی کەلەشێوەی گردۆلکەدا لەرێڕەوی سەهۆڵینەکاندا دروست دەبێت وتیرە گەورەکەی بەئاراستەی رێڕەوەکەیە. |
| ***Druzy*** | دروزی: جۆرێکە لە تنراو کە تیایدا بلوورەکان بەرەو ناوەوە تەبارەیان گەورە دەبێت. |
| ***Drying*** | وشککردنەوە |
| ***Ductile*** | کشاو |
| ***Dull*** | لێڵ ، تاریك |
| ***Dune*** | تەپۆلکەی لمی |
| ***Durability*** | هێزی خۆگری |

Dura/Dyso

| | |
|---|---|
| ***Duration*** | ماوە |
| ***Dust*** | تۆز |
| ***Dynamic*** | جوڵە ، داینامیکی |
| ***Dysodont*** | بێددانەکان |

# -Ee-

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| Earth | زەوی ، زەمین :سێیەم هەسارەی کۆمەڵەی خۆر. |
| Earth creep | لەجێچوون یان خلیسکانی زەوی |
| Earthquake | بوومەلەرزە ، گوومە لەرزە |
| Earth science | زانستی زەوی |
| Earth crust | توێکڵی زەوی |
| Ebb and flow | داکشان و هەڵکشان |
| Ebb tide | داکشانیئاوی دەریا |
| Ecdysis | توێژ داماڵین |
| Echelon fold | نوشتاوەی پلەکراو |
| Echinodermata | پێست دڕکاوییەکان: لقێکە لە گیانداره بێبڕبڕەکان کە هاویەکییەکیپێنجی هەیە و پەیکەرەکەی لە کلس پێکهاتووە. |
| Echinoidea | ژیشکی دەریا: بەشێکە لە لقی پێست دڕکاوییەکان کە دەناسرێن بە پەیکەری گۆیی یان لەپکەی. |
| Eclipse | گیران |
| Ecology | زانستی ژینگە |
| Economic geology | جیۆلۆجیای ئابووری |
| Ecosystem | رژێمەکانی ژینگە |
| Ecoulement | خلیسکانی تەکتۆنی کەڤر |
| Ectoderm | دەرەچین |
| Efficiency | توانست |
| Effusion | هەڵقوڵین، رژان: رژان یان رۆیشتنی لاڤا لەسەر رووی زەوی. |
| Ejection | هاویشتن |
| Elastic | جیر ، لاستیکی |
| Elastic deformation | شێوانی جیری |
| Elasticity | جیری |
| Elastic limit | رادەی جیری: گەورەترین فشارە کە توانای گۆڕانی مادەی هەیەو پاش لابردنی ئەم فشارە مادەکە دەگەڕێتەوە دۆخی جارانی واتە گۆڕانەکە لادەچێت بە لابردنی فشارەکە. |
| Electrode | جەمسەر |
| Element | توخم: بەو مادەیە دەوترێت کە گەردیلەکانی هەمووی یەکجۆرن. |
| Elevation | بەرزی |

Elim/Era

| | |
|---|---|
| *Elimination* | لابردن |
| *Ellipse* | هێلکەیی |
| *Ellipsoidal* | شێوە هێلکەیی |
| *Elongation* | درێژبونەوە |
| *Eluvial* | وردەوویی |
| *Eluvium* | نیشتووی بایی: ئەونیشتووەیە کەبەهۆی باوە دەنیشێت. |
| *Embouchure* | ئاوەڕێژ (ڕێژگە) |
| *Emergence* | بەرزەك |
| *Enantiomorphism* | ئینانتۆمۆرفیزم: سیفەتی ئەو دوو کریستاڵەیە کە هەمان شێوەیان هەیە بۆ نموونە کوارتزی دەستە راست و دەستە چەپ. |
| *Endoderm* | ناوە چین |
| *Endogenic deposit* | نیشتووی ناوەکی |
| *Energy* | وزە |
| *Engineering geology* | جیۆلۆجیای ئەندازیاری |
| *Entire* | تەواو |
| *Enviroment* | دەوروبەر ، ژینگە: هەموو ئەو بارودۆخە فیزیایی و کیمیاییانەیە کە کار دەکاتە سەر زیندەوەران. |
| *Eolian* | بایی ، هەوایی |
| *Eon , Aeon* | چەرخ: درێژترین یەکەی دابەشکردنی کاتی جیۆلۆجیە. لە دوایەوە یەکەی چاخ دێت. بۆ نموونە Phanerozic Eon. |
| *Epeirogenesis* | جوڵەی دروست بوونی کیشوەرەکان: بریتییە لەو جوڵانەی کە بۆ سەرەوە یان بۆ خوارەوە (ستوونی) روو دەدات لەناوچە کیشوەرییەکان یان ئۆقیانووسەکان و دەبێتە هۆی دروستبوونی کیشوەرەکان. |
| *Epicenter* | چەقی ڕووی بوومەلەرزە |
| *Epitheca* | بەرگی سەرەوە |
| *Epoch* | سەردەم: بەشێکە لە کاتی جیۆلۆجی گەورەترە لە تەمەن و بچووکترە لە ماوە. |
| *Equation* | هاوکێشە |
| *Equator* | هێڵی یەکسانی ، کەمەرەی زەوی |
| *Equilibrium* | هاوسەنگی |
| *Equivalent* | هاوتا |
| *Equivalve* | دوو دەروازە یەکسان |
| *Era* | چاخ: یەکەیەکی کاتی جیۆلۆجیە لە چەرخ کەمترەو دابەش دەکرێت بۆ دوو ماوە یان زیاتر. بۆ نموونە Paleozoic Era واتە چاخی ژیانی کۆن. |

| | |
|---|---|
| ***Erathem*** | ئیراثم: گەورەترین یەکەی چینزانییە لە رووی کاتەوە کە مەبەست لەو کەڤرانەیە کە لە چاخێکدا دروست بوون. |
| ***Erosion*** | رووتبوون و داماڵین: سەرجەم ئەو کردارانەیە کە دەبێتە هۆی وردبوون و شیبوونەوەی کەڤرەکانە و گواستنەوەیان لە شوێنی خۆیان. واتە کردارەکانی کەشاندن و گواستنەوە دەگرێتەوە. |
| ***Eruption (Volcanic)*** | هەڵچوونی گڕکانی |
| ***Escarpment*** | رادان، تەلان: لە جیۆمۆرفۆلۆجیدا بەو رووە زۆر لێژە بەردەوامە دەوترێت کە بەیەک لادا رووی کردووە. بەهۆی داخوران و داماڵین وە یان بە هۆی لێکدابڕاوەوە دروست دەبێت. بە هەمان مانای Scarp دێت. |
| ***Essential mineral*** | خاوی سەرەکی: بەو خاوە دەوترێت کە پێویستە لە ناونان و پۆلێنکردنی کەڤرەکاندا، مەرج نییە گەورەترین رێژە پێکبهێنێت لە کەڤرەکەدا. |
| ***Eustrine deposits*** | نیشتووی رێژگەکان |
| ***Etching*** | هەڵکەندنی کیمیاوی |
| ***Eugeosyncline*** | ئیۆجیۆسینکلاین: بەو جیۆسنکلاینە دەوترێت کە هاوکات لەگەڵ نیشتنی نیشتووە وردبووەکاندا گڕکانیشی تیا روودەدات. واتە بەشی گڕکانی لە ئۆرثۆجیۆسنکلاین. |
| ***Euhedral crystal*** | بلوورە رووتەواوەکان |
| ***Eustatic*** | گۆڕانی جیهانی ئاستی دەریا |
| ***Eutectic point*** | خاڵی شلۆق ، خاڵی رەقبوون: نزمترین پلەی گەرماییە کە تیایدا تێکەڵەیەکی شلۆق شل دەبێتەوە. |
| ***Euxinic*** | ژینگەی بێ ئۆکسجین |
| ***Evaporation*** | هەڵمین |
| ***Evaporites*** | نیشتووی هەڵمینی: نیشتووە خوێییەکان کەبە هەڵمینی گیراوەکان دەنیشێن. وەک جیپسۆم و خوێی چێشت. |
| ***Event*** | رووداو |
| ***Evidence*** | بەڵگە |
| ***Evolution*** | گەشەسەندن، پەرەسەندن،دۆخگۆڕی: گۆڕانی بونەوەران بەرەو باشتر خۆگونجاندان لەگەڵ هۆکارەکانی ژینگەدا. تیۆری گەشەسەندنی وردە وردەی ژیانە لەسەر زەوی، لەیەکێك یان چەند زیندەوەرێکی سادەی سەرەتاییەوە بۆ زیندەوەرانی زیاتر ئاڵۆز. |
| ***Excavate*** | هەڵدەکۆڵێت یان دەردەهێنرێت |
| ***Excitation*** | هەژاندن |
| ***Exfilteration*** | دەرکردن |

*Exfo/Eyep*

| | |
|---|---|
| ***Exfoliation*** | بوون بە توێژاڵ: کرداری بوون بە توێژاڵ و هەڵوەرینی کەڤرەکان بۆ بەرگی تەنك تەنك. |
| ***Exogentic deposit*** | نیشتووی دەرە دروست بوو |
| ***Exogeosyncline*** | ئیکسۆجیۆسنکلاین: بەو پارا جیۆسنکلاینە دەوترێت کە نیشتووە وردەکانی لەناوچە بەرزەکانی ئۆرثۆجیۆسنکلاینەوە بۆ دێت و دەکەوێتە دەرەوەی ناوچە جێگیرەکان. |
| ***Expansion*** | کشان |
| ***Exploration*** | پشکنین |
| ***Explosion crater*** | دەمی تەقینەوەی گڕکان |
| ***Exposure*** | دەرخستن |
| ***Extension*** | درێژایی |
| ***External*** | دەرەکی |
| ***Extinction*** | قڕتێکەوتن[1] ، تاریکی[2]:<br>[1] لە ناوچوون و قڕتێکەوتنی گشتی زیندەوەرێك بە جۆرێك کە ئیتر لەوە بەدواوە نابینرێت.<br>[2] یەکێکە لە سیفاتە بینایییەکانی خاوەکان کە تیایدا خاوەکە بەتەواوی تاریك دەبێت کاتێك لە ژێر وردبیندا تەماشا دەکرێت بە بەکارهێنانی هاوێنەکانی نیکۆل. دروست دەبێت لەکاتی یەکتر بڕینی جەمسەرگرو شیکەرەوە بە جۆرێك نایەڵێت رووناکی تێپەڕ بێت و دەبێتە هۆی تاریکی. |
| ***Extinction angle*** | گۆشەی کوژانەوە یان تاریکی: ئەو گۆشەیەیە کە تیایدا خاو لەژێر وردبیندا تاریك دەبێت و دەپێورێت بەهۆی بادانی شانۆی وردبینەکەو پێوانی گۆشەکە لە روویەکی دیاریکراوەوە. زانینی ئەم گۆشەیە سود بەخشە بۆ ناسینەوەی هەندێ لە کریستاڵەکان. |
| ***Extraction*** | دەرهێنان |
| ***Extra ordinary ray*** | تیشکی نائاسایی |
| ***Extreme value*** | بەرزترین بەها |
| ***Extrusive rocks*** | کەڤری دەرهاوێژراو: بەو کەڤرە ئاگرینانە دەوترێت کەلەسەر رووی زەوی رەقبوون. بەهەمان مانای **Volcanic rocks** دێت. |
| ***Eyepiece*** | چاوە هاوێنە: بەو هاوێنانە دەوترێت لە وردبیندا یان تەلەسکۆپدا کە بەهۆیەوە بینراو دەبینرێت. |

# -Ff-

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| Fabric | تنراو: زاراوەیەکە بەکاردێت بۆ دیاریکردنی چۆنێتی ئاراستەی دەنکۆڵە و کریستاڵ و مادەی سمنتی لە کەفرە نیشتووەکان یان ئاگرینەکاندا. |
| Face | روو ، رووکار |
| Facial | روویی |
| Facial suture | درزە روو |
| Facies | شێواز: زاراوەیەکی گشتییە سەرجەم ئەو سیفاتە کەفری بە بەردبووانەی دەگرێتەوە کە کەفرێکی نیشتووی لە یەکێکی تر جیا دەکاتەوە. هەروەها بۆ جیاکردنەوەی کەفرە گۆڕاوەکانیش بەکاردێت. |
| Factor | هۆکار |
| Fade | ئەپوکێتەوە |
| Failure | داڕمان، دابڕان (هەرەس) |
| False bedding | چینبووی بڕاو: بە هەمان مانای Cross bedding دێت. |
| Family | خێزان: بەشێکە لە بەشەکانی پۆلێنکردن دەکەوێتە نێوان پۆل و رەگەزەوە. |
| Fan fold | نوشتاوەی پەروانەیی |
| Fanglomerate | چەوی رووباری |
| Fault | لێکترازاو، لێکدابڕاو: بریتییە لەو رووەی کە لەم لاو ئەولای دا جوڵەیەکی هەست پێکراو لە چینەکاندا روودەدات و ئاراستەی ئەم جوڵەیە هەموو کاتێك تەریب دەبێت بە رووە لێکترازاوەکە. |
| Fault escarpment | لێژی لێکترازاو. |
| Fault line | هێڵی لێکترازاو: بریتییە لە شوێنەواری رووی لێکدابڕاو لەسەر رووپەك. |
| Fault plane | رووی لێکترازاو |
| Faults (step) | لێکترازاوی شێوە پلە پلە |
| Fault strike | لێدەری لێکدابڕاو یان لێکترازاو |
| Fauna | گیانەوەران : سەرجەم گیانەوەران (بە زیندوو و بە بەردبووەوە) لە رووبەرێك یان ژینگە یان کاتێکی دیاریکراودا. |
| Fell | کەوتوو، کەوتنە خوار |

*Feld/Flan*

| | |
|---|---|
| **Feldspar** | فلدسپار: کۆمەڵێك خاوی زۆر بڵاوە کە دادەنرێت بەو خاوانەی کەکەڤرەکان دروست دەکەن. بەشێوەیەکی گشتی پێکهاتووە لە: $M\ Al\ (Al, Si)_3\ O_8$ کاتێك کە:- $M = K, Na, Ca, Ba, Rb, Sr, Fe$ نزیکەی ڕێژەی 60٪ پێکهاتنی توێکڵی زەوی پێکدەهێنێت. |
| **Felsic (acidic)** | کورتکراوەی هەردوو وشەی فلدسپارو سلیکایە بەو کەڤرە ئاگرینانە دەوترێت کە خاوەکانیان سپی یان کراوەیە. |
| **Fence diagram** | شێوەی دیواری: ئەو شێوە تەنە ئەندازەییە کە بەکاردێت بۆ پیشاندانی پەیوەندی چینەکان لەگەڵ یەکتر. |
| **Ferroan** | هەڵگری ئاسن |
| **Ferruginous** | ئاسنی: بەو کەڤرە دەوترێت کە هەڵگری ئاسن بێت تیایدا. وەك ئەو بەردە لمییەی کە مادە سمنتیەکەی ئۆکسیدی ئاسنە. |
| **Fiber** | ریشاڵی |
| **Field** | کێڵگە، مەیدان: زاراوەیەکی گشتییە بەو شوێنە سروشتییە دەوترێت کە زەوی ناس تیایدا داتای جیۆلۆجی کۆدەکاتەوە وەك پێوانی لاری و لێدەری چینەکان و کۆکردنەوەی نموونە لە کەڤرو بەردبووەکان. |
| **Field geology** | جیۆلۆجیای مەیدانی |
| **Figure** | شێوە، نیگار |
| **Film** | تەنك |
| **Filter** | پاڵێوگە |
| **Fine** | ورد |
| **Fineness** | وردی |
| **Fire clay** | قوڕی ئاگری : جۆرێکە لە قوڕ کەبەکاردێت بۆ کاری سیرامیکی وە بەرگەی پلەی گەرمی بەرز دەگرێت 1250–1300م°، توانای پلاستیکی بەرزە. |
| **Fissile bedding** | چینبووی شەقبوو |
| **Fissilty** | شەقبوون |
| **Fissure** | درز |
| **Fjord** | کەنداوی قووڵ |
| **Flagellum** | قامچی |
| **Flag stone** | کەڤری دەفەیی |
| **Flaking** | بوون بە توێژاڵ |
| **Flaky mineral** | خاوە تەنکەکان |
| **Flank** | لا ، باڵ |

Flas/Focu

| | |
|---|---|
| ***Flash point*** | خاڵی درەوشاوە |
| ***Flat*** | رووتەخت |
| ***Flexible*** | جیڕ: بەو خاوە دەوترێت کە توانای خواربوونەوەی هەیە بەبێ شکان بەڵام ناگەڕێتەوە شێوەی بنچینەی خۆی وەك تالك. |
| ***Flexibility*** | جیڕی |
| ***Flexure*** | خواربونەوە، نوشتانەوە |
| ***Flexure fold*** | نوشتاوەی خلیسکاو |
| ***Flint*** | بەردە ئەستێ: زاراوەیەکە بەکاردێت بۆ ئەو بەردەئەستێیانەی کە رەشن بەشێوەی تۆپەڵەو زۆر رەقەو رووی شکاندنەکەی لە شێوەی گوێچکەماسیدایە(محاری یە). |
| ***Floatation*** | سەر ئاو کەوتن |
| ***Flora*** | رووەکەکان: سەرجەم رووەکەکانی رووبەرێکی دیاریکراو یان ژینگەیەکی دیاریکراو یان کاتێکی دیاریکراو دەگرێتەوە. |
| ***Flood plain*** | دەشتی لافاوی: بەشێوەیەکی گشتی پێکهاتووە لە لم و قوڕ دەنیشێت بەهۆی رووبارەوە ، لەم لاو ئەولای رووبارەکە کاتێك لافاو هەڵئەسێت. |
| ***Flow*** | لێشاو، رۆیشتن |
| ***Fluctuation*** | 1 .لەرینەوە .<br>2. گۆڕانی ئاست :بەرزبونەوەو نزم بوونەوەی ئاستی رووی هەر ئاوێك. |
| ***Fluid*** | شلە، شل: زاراوەیەکە بەکاردێت بۆ شلەکان و گازەکان پێکەوە. |
| ***Fluid injection*** | پاڵپێوەنانی شلەکان |
| ***Flume*** | جۆگە، دەربەند |
| ***Fluorescence*** | تیشك مژین و دانەوەی بەشێوەی رووناکی |
| ***Flush valve*** | زمانەی پاککردنەوە |
| ***Fluvial*** | رووباری |
| ***Fluviometer*** | قووڵاییپێوی رووبار |
| ***Flysch*** | کەڵرە میکانیکییەکان (فلێش): زاراوەیەکی وەسفییە بۆ ئەو نیشتووە دەریایانەی کە پێکهاتون لە چینی ئەستوری بەردبوو کەم، بەشێوەیەکی سەرەکی پێکهاتوە لە مارل و لم و قوڕی کلسی و قوڕو هەروەها چینی چەو و لمی زبر تێهەڵکێش دەبن. |
| ***Focus*** | تیشکۆ: ئەو خاڵەیە لەناو زەویدا کە تیایدا بوومەلەرزە روودەدات مەڵبەندی بوومەلەرزەکەیە و لەوێوە شەپۆلە بوومەلەرزەییەکان بڵاودەبنەوە. |

Fold/Frac

| | |
|---|---|
| ***Fold*** | نوشتاوە، چینە چەماوەکان: پێکهاتوویەکی چەماوەیە لە چینەکان لەوانەیە کوڕ بێت یان چاڵ بێت. لە ئەنجامی شێوانی چینەکانەوە دروست دەبێت. |
| ***Fold axis*** | تەوەرەی نوشتاوە |
| ***Fold limb*** | باڵی نوشتاوە |
| ***Fold plane*** | رووی تەوەرەی نوشتاوە |
| ***Foliation*** | پەرە پەرە، توێ توێ : یەکێکە لە رەوشتی هەندێك لە بەردە گۆڕاوەکان . |
| ***Foot wall*** | پادیوار، دیواری ژێرەوە: بەشی ژێرەوەی لێکترازاوە کە دەکەوێتە ژێر هێڵی لێکترازاوەوە. |
| ***Foraminifera*** | کوندارەکان، فۆرام: پۆلێکن لە یەك خانەییەکان، پەیکەرەکەیان بەزۆری لە کاربۆناتی کالسیۆم پێکدێت (بەدەگمەنیش لە سلیکاو ئەرەگۆنایت) لە یەك ژوور یان زیاتر کە بەشێوەی جیا جیا ریز بوون پێکهاتووە. لە چاخی کامبرییەوە تا ئیستا هەیە. |
| ***Force*** | هێز |
| ***Fore limb*** | باڵی پێشەوەیی |
| ***Fore reef*** | مۆڵگەی پێشەوە |
| ***Fore shock*** | پێشە لەرزە |
| ***Fore shore*** | پێشەوەی کەنار |
| ***Form*** | شێوە |
| ***Formation*** | پێکهاتوو: بریتییە لە یەکەیەکی سەرەکی و بنەڕەتی چینزانی ـ کەڤری ،پێکدێت لە پارچەیەك یان بەشێك لە کەڤری نیشتوو کە دەناسرێت بەوەی سیفاتی کەڤری لەیەکچووی هەیە ، وەك پێکهاتنی کیمیایی و تنراو و پێکهاتووی ناوەوە و بەردبووەکانی دەبێت .پێکهاتوو ئەستوورییەکەی هێندە هەبێت کەلەسەر نەخشە بتوانرێت وێنە بکێشرێت. |
| ***Fossil*** | بەبەردبوو، بووبەرد: هەر پاشماوەیەك یان شوێنەوارێکی گرنگی گیانەوەران یان رووەکەکان کە پارێزرابێت بەهۆی هۆکارە سروشتییەکانەوە لە توێکڵی زەویدا لە کاتێکی جیۆلۆجی رابردوودا ، یان هەر بەڵگەیەکی ژیانی رابردووە. |
| ***Fraction*** | کەرت، بەش |
| ***Fractional crystallization*** | کەرتە بلووربوون: جیابوونەوەی ماگمای ساردەوەبو بۆ پارچە پارچە بەهۆی بەبلوور بوونی لەدوای یەکی خاوە جیاوازەکان لەگەڵ نزم بوونەوەی پلەی گەرمادا. |

Frac/Fusi

| | |
|---|---|
| ***Fractionating column*** | ستوونی بەش بوون : زاراوەیەکی تایبە تە بە زانستی بەردە ئاگرییە کان. |
| ***Fracture*** | شکانگە: ئەو شێوەیەی کە خاو وەری دەگرێت لە کاتی شکانیدا. |
| ***Fracture line*** | هێڵی شکان |
| ***Fragile*** | شکستەیی |
| ***Fragment*** | تەڵەزم، وردە |
| ***Frame*** | چوار چێوە |
| ***Frequency*** | چەند پات بوونەوە، لەرە |
| ***Fresh water*** | ئاوی شیرین: ئەو ئاوەیە کە رێژەیەکی زۆر کەم لە خاوە تواوەکانی تیادایە وەك ئاوی رووبار. |
| ***Friction*** | لێکخشان: بەرگری میکانیکی جوڵەی لەشێکی جوڵاو لەگەڵ ئاوەندێکدا. |
| ***Frontal*** | پێشەرەیی |
| ***Frost*** | شەختە |
| ***Frost crack*** | شەختە شەقبوون |
| ***Fuel*** | سووتەمەنی |
| ***Function*** | پابەند |
| ***Fundamental*** | بنچینەیی |
| ***Furrow*** | کەندەك: زاراوەیەکە بۆ چاڵێکی باریك، پاتر لە هێڵ لە ئەنجامی داخوران و رامالینی بەرد و قووڵ کردنی سەر رووی زەوییەوە دروست دەبێت بەهۆی سەهۆڵبەندان یان لێکدابڕانەوە. |
| ***Fusibility*** | توانای توانەوە |
| ***Fusiform*** | تەشیلەیی یان شیوە تەشیلە یی |
| ***Fusion*** | شل بوونەوە یان شلەوبوون |

# -Gg-

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| *Gabbro* | گابرۆ: کەڤرێکی ئاگرینە لە قووڵایدا دروست دەبێت و پێکهاتووە لە خاوەکانی بلاجیوکلێسی کلسی و پایرۆکسین و ئۆلیفین ڕەنگەکەی ڕەشەو دەنکۆڵەکانی گەورەن . |
| *Galaxy* | کۆ ئەستێرە |
| *Gamma ray* | تیشکی گاما |
| *Gangue mineral* | خاوی بێ سوود : ئەو خاوەی لە ڕووی ئابوورییەوە سوودی نییە. |
| *Gap* | کەلێن، کون |
| *Gaping fault* | کەلێنە لێکترازاو |
| *Garnet* | گارنێت: کۆمەڵە خاوێکە کە پێکهاتووە لە سلیکاتی ئاڵۆز لە کالسیۆم و مەگنسیۆم و ئاسن و مەنگەنیز بەشێوەیەکی گشتی: $A_3B_2(SiO_4)_3$ لە کاتێکدا $A=Ca, Mg, Fe^{+2}, Mn^{+2}$ $B=Al, Fe^{+3}, Mn^{+3}, Cr$ بە گشتی ڕەنگیان سوورەو بەکاردێن وەك بەردی بەنرخ و وەك بەردی سافکردن. |
| *Gas cap* | کڵاوەی گاز |
| *Gaseous fuel* | سووتەمەنی غازی |
| *Gas field* | چاڵگەی گاز |
| *Gash fracture* | شکان بە ڕاکێشان |
| *Gas – oil surface* | جیاکەرەوەی ڕووی نێوان گاز و نەوت |
| *Gastropoda* | پێسکییەکان: پۆلێکە لە نەرمۆڵەکان پەیکەرەکانیان کلسییەو بەشێوەیەکی لوول پێچەو بەربەستی تیادا نییە. |
| *Gas well* | بیری گازی |
| *Gas zone* | ناوچەی گازی |
| *Gauge* | پێوەر |
| *Geanticline* | چینە چەماوە کووپی گەورە: بەشێکی گەورەی بەرزەوەبووی جوڵاو لە توێکڵی زەوی بەرامبەر بە Geosyncline دێت. |
| *Gemstone* | گەوهەر: هەر خاوێك یان بەردێك یان هەر مادەیەکی سروشتی تەنانەت مادەی ئەندامیش (وەك کارەبا، لەپکە....هتد) کە پاش بڕین و سافکردنی زۆر جوانەو بەکاردێت بۆ ڕازاندنەوەو جوانکردن. |

| | |
|---|---|
| *Generative fold* | چینە چەماوە زیادبووەکان |
| *Genesis* | درووست بوون |
| *Genotype* | رەگەزی نموونەیی |
| *Genuine* | بێگەرد |
| *Genus* | رەگەز: بەشێکە لە بەشەکانی پۆلێنکردن پێکدێت لەو جۆرانەی کە لە یەك دەچن. لە خێزان بچوکترەو لە جۆریش گەورەترە. |
| *Geochemistry* | زانستی کیمیایی زەوی، جیۆ کیمیا: ئەو زانستەیە کە لە بڵاوبوونەوەو رێژەی توخمە کیمیاییەکان دەکۆڵێتەوە لەناو خاوەکان و کەڤرەکان و خامەکان و خۆڵ و ئاو بەرگی هەوادا. |
| *Geochronology* | زانستی رۆژمێری زەوی: لێکۆڵینەوە لە پەیوەندی کات لەگەڵ مێژووی گۆی زەویدا. |
| *Geode* | جیۆد: بریتییە لە پێکهاتوویەکی خڕ یان نیمچە خڕی بۆش تیرەکەی لە نێوان 2.5سم تا 30سم دەبێت یان زیاتر، لەناو کەڤرەکانی بەردی کلس و بەردی قوڕیدا هەیە. بە چینێك چالسیدونی دەورە دراوەو بۆ ناوەوە کریستاڵەکانی کوارتز یان کالسایت بەشێوەی درزی هەیە. |
| *Geodesy* | زانستی رووپێو |
| *Geogeny* | زانستی (تیۆری) دروست بوونی زەوی |
| *Geohydrology* | زانستی ئاوی ژێر زەوی |
| *Geological event* | رووداوی جیۆلۆجی |
| *Geological exploration* | پشکنینی جیۆلۆجی |
| *Geological phenomena* | دیاردە زەویناسیەکان |
| *Geological record* | تۆمارگەی زەویناسی |
| *Geological section* | بڕگەی جیۆلۆجی |
| *Geological survey* | رووپێوانی جیۆلۆجی |
| *Geological time table* | خشتەیکاتی جیۆلۆجی: بریتییە لە خشتەیتەمەنەکانی جیۆلۆجی لە کۆنەوە بۆ نوێ . |
| *Geology* | زەویناسی ، زەویزانی ، زەمینزانی: زانستی خوێندن و لێکۆڵینەوەی هەسارەی زەوی، لە رووی دروست بوون و گەشە سەندن و شێوەو مێژوو و هەموو ئەو هۆکارانەی کە کاری کردۆتە سەری لە رابردوو و ئێستادا. بەهەمان مانای زانستەکانی زەوی و زانستە جیۆلۆجیەکان دێت. |
| *Geomagnetic field* | کایەی موگناتیسی زەوی |

Geom/Glob

| | |
|---|---|
| ***Geomagnetic poles*** | جەمسەرەکانی موگناتیسی زەوی |
| ***Geomorphology*** | زانستی شێوەکانی زەوی: ئەو زانستەیە کە لە شێوەی سەر رووی زەوی دەکۆڵێتەوە، لە رووی بنچینەو گەشەسەندن و پۆلێنکردن و سروشت و وەسفی ئەو شێوانەی رووی زەوی و پەیوەندیان لەگەڵ چینەکانی ژێرەوە. |
| ***Geophone*** | شەپۆل وەرگر |
| ***Geophysical exploration*** | پشکنینی جیۆفیزیایی |
| ***Geophysics*** | جیۆفیزیا: لێکۆڵینەوەی هەسارەی زەوی بەهۆی سوود وەرگرتن لە سیفاتە فیزیاییەکانی زەوی. |
| ***Geosyncline*** | جیۆسینکلاین (چاڵە نوشتاوەی گەورە): بەشێکی گەورەی نزم بووەوەی جولاوی توێکڵی زەوی بەشێوەی حەوزێکی درێژی گەورە کە چینە نیشتووەکانی ئەستوورەو کەڤری ئاگرینیشی تیادایە لەوانەیە ئەستورایی چینە کۆبووەوەکان بگاتە هەزارەها مەتر. بەرامبەر وشەی Geanticline دێت. |
| ***Geothermal*** | گەرمایی زەوی |
| ***Geothermometry*** | زانستی گەرمی زەوی |
| ***Geysers*** | فوارە گەرمەکان |
| ***Giant*** | زەبەلاح، گەورە |
| ***Glacial*** | سەهۆڵی، بەستەڵەکی |
| ***Glacial deposits*** | نیشتووی سەهۆڵی : بریتییە لەو نیشتووانەی کە بەهۆی رووباری سەهۆڵییەوە لە سەردەمی سەهۆڵ بەنداندا دەنیشێت . |
| ***Glacial grooves*** | کەندەکی سەهۆڵی |
| ***Glacier*** | بەفراوەر: تۆپەڵێکی یەکجار گەورە لە سەهۆڵ کە لەسەر زەوی لە ئەنجامی پەستان و دووبارە کریستاڵ بوونەوەی بەفر دروست دەبێت. بەشێوەیەکی هێواش جوڵە دەکات و دەخشێت لە ژێر کاری کێشەکەیدا. |
| ***Glaciology*** | زانستی بەفراوەر، بەفراوەر زانی: ئەو زانستەیە کە لە بەفراوەرەکان دەکۆڵێتەوە لە رووی دروست بوون و گەشەسەندن و پێکهاتووەکانی. |
| ***Glance*** | بریسکە |
| ***Glass sand*** | لمی شوشە، شوشە لم |
| ***Glassy*** | شوشەیی |
| ***Glide plane*** | خزە روو، رووی خزان |
| ***Globe*** | گۆی زەوی |

| | |
|---|---|
| ***Globigerina*** | گلۆبیجێرینا: یەکێکە لە رەگەزە بەناوبانگەکانی کوندارەکان کە پەیکەرەکەی کلسییەو زۆر جار ئوز دروست دەکات. لە چاخی جوراسیکی ناوەڕاستەوە دەرکەوتووە و تا ئیستا بەردەوامە. |
| ***Globigerina ooze*** | ئووزی گلۆبیجیرایینا |
| ***Globular*** | گۆیی |
| ***Glow*** | دەدرەوشێتەوە |
| ***Gneiss*** | نایس: کەڤرێکی گۆڕاوی دەنکۆڵە گەورەیە و بەشێوەی چین چینە لە ئەنجامی گۆڕانی ناوچەییەوە دروست دەبێت پێکهاتووە لە کوارتز و فلدسپار بەشێوەیەکی گشتی. |
| ***Gold*** | زێڕ، ئاڵتون: خاوێکی زەردی، نەرمی یەك توخمییە (Au). زۆر جار بەشێوەی داڕشتە دەبێت لەگەڵ مس یان زیو. لە نیشتووی رووبارەکاندا بەشێوەی دەنکۆڵە هەیە یان لەگەڵ کوارتز و گۆگردیکەکاندا بەشێوەی دەمار هەیە. بۆ خۆ جوانکردن و وەك پێوەرێکی جیهانی ئابووری بەکاردێت. |
| ***Gondwana land*** | کیشوەری گۆندوانا: کیشوەرێکی کۆنە بریتی بوو لە هند و ئوستورالیاو خوارووی ئەفریکا و جەمسەری باشوور پێش ئەوەی وەك ئێستا دابەش بین. |
| ***Gorge*** | دەربەند: دۆڵێکی قووڵی تەسکی بچوکەو کەڤرەکانی ئەم لاو ئەو لای نزیکە ستونن دەکەوێتە نێوان چەند شاخێکەوە. |
| ***Graben*** | گرابن: بریتییە لە بلۆکێکی دابەزیو (داتەپیو) لە نێوان دوو لێکترازاودا. |
| ***Gradation*** | پلە کردن |
| ***Graded*** | پلە پلە کراو |
| ***Graded bedding*** | چینبووی پلە پلە کراو : یەکێکە لە رەوشتەکانی بەردە نیشتووەکان کە دەنکۆڵەکان لە گەورەوە بۆ بچوك ریزدەبن . |
| ***Gradient*** | پلەی لاری |
| ***Grain*** | دەنکۆڵە: وردکۆکەی خاوە یان کەڤر کە بچوکترە لە پارچە، تیرەکەی کەمترە لە چەند ملیمەترێك وەك دەنکۆڵەی لم. |
| ***Granite*** | گرانایت: کەڤرێکی ئاگرینی دەنك گەورەیە لە قووڵایدا دروست دەبێت و کوارتز رێژەی 10٪ تا 50٪ لە خاوە رەنگ کاڵەکان پێکدەهێنێت. بەگشتی پێکهاتووە لە کوارتز و فلدسپار و مایکا. وەك زاراوەیەکی گشتی بەکاردێت بۆ هەموو ئەو کەڤرە ئاگرینانەی کە کریستاڵەکانی تەواو و کوارتزی تیادایە. |
| ***Granitization*** | کرداری دروست بوونی گرانایت |
| ***Granodiorite*** | گرانۆ دایۆرایت: کۆمەڵە کەڤرێکی ئاگرینی دەنکۆڵە گەورەیە لە قووڵایدا دروست دەبێت. پێکهاتووە لە کوارتز و بلاجیوکلیز و فلدسپاری پۆتاسیۆمی و بایوتایت. |

Gran/Groo

| | |
|---|---|
| *Granular* | دەنکۆڵەیی |
| *Granular structure* | دەنکۆڵە پێکهاتوو |
| *Granular texture* | ڕەشتەی دەنکۆڵەدار |
| *Graph* | شێوەی ڕوون کەرەوە، هێڵی ڕوونکەرەوە. |
| *Graphite* | گرافیت: خاوێکی ڕەشی نەرمە لە کاربۆن پێکهاتووەو لەسەر سیستەمی شەشی دەبێت بە کریستاڵ. گەیەنەرێکی باشی کارەباو گەرمییە. |
| *Gravel* | چەو: کۆبوونەوەیەکی پێکدانەنووساوە لەو دەنکۆڵە خڕانەی کە تیرەکەیان لە 2ملم گەورەترە. بەگشتی بەشێکە لە بەشەکانی کەڤرە وردبووەکان. |
| *Gravimeter* | ئامێری پێوەری کێشی جۆری |
| *Gravitational force* | هێزی کێشکردن |
| *Gravity* | کێشکردن |
| *Gravity fault* | کێشکردنە دابڕاو |
| *Gray wacke* | گرەی واکی: کەڤرێکی لمی دەنکۆڵە گەورەیە ڕەنگەکەی ڕەشە یان خۆڵەمێشی تۆخ ، پێکهاتووە لە پارچە پارچەی کەڤری ترو فلدسپار و کوارتز و بەردە ئەستێ و قوڕو بەتوندی پێکەوە بەستراون. |
| *Greasy luster* | چەورە بریسکە |
| *Great circle* | بازنەی گەورە: ئەو چەماوەیەیە کە لەسەر ڕووی هەر گۆیەك دروست دەبێت لە ئەنجامی یەکتربڕینی لەگەڵ هەر ڕوویەك کە بەچەقی گۆکەدا بڕوات. |
| *Green stone* | بەردی سەوز (سەوزە بەرد): زاراوەیەکی گشتییە بەو کەڤرانە دەوترێت کە ڕەنگیان سەوزە. |
| *Grid* | تۆڕ |
| *Grinding* | سافکردن ، لووسکردن |
| *Grindstone* | بەردی سافکردن |
| *Grit* | بەردی لمی زبر |
| *Groove* | کەندڕ، کەندەك: چاڵێکی درێژی ڕاستی تەسکە لەسەر ڕووی بەردە قوڕییەکان دروست دەبێت بەهۆی تەوژمی ئاوەوە. |
| *Groove cast* | داڕێژگەی کەندڕ: زاراوەیەکە بەکاردێت بۆ ئەو بەرزاییە شێوە تیژ یان خڕە کە چەند ملیمەترێك بەرزەو چەند سانتیمەترێك درێژو پانە. لەبنی چینە لمیەکاندا دروست دەبێت لە ئەنجامی پڕ بوونەوەی ئەو کەندەڕەی کە لەسەر ڕووی چینە قوڕیەکان دروست بووە. |

Grou/Gyps

| | |
|---|---|
| ***Ground*** | زەمینە، بنچینە |
| ***Ground water*** | ئاوی ژێر زەوی: ئەو بەشە ئاوەی ژێر زەوییە کە لە ناو پشتێنەی تێربوونددا هەیە. |
| ***Group*** | کۆمەڵ |
| ***Grouping*** | کۆمەڵکردن |
| ***Growth ring*** | سووڕی گەشە |
| ***Guide fossils*** | بەبەردبووە رابەرەکان: هەر بووبەردێك کە بەسوود بێت لە دیاریکردنی تەمەنی جیۆلۆجیدا. لە سیفاتەکانی دەبێت تەمەنێکی جیۆلۆجی کورتی هەبێت و بڵاوبوونەوەیەکی جوگرافی فراوانی هەبێت و زۆر بێت و ناسینەوەشی ئاسان بێت. بەهەمان مانای Index fossils دێت. |
| ***Gullying*** | هەڵکۆڵین |
| ***Gushing spring*** | کانی هەڵقوڵاو |
| ***Gutenberg discontinuity*** | نابەردەوامی گۆتنبرگ: ئەو نابەردەوامییەیە کە بەرگەکانی کەوڵ و کرۆکی زەوی لێك جیا دەکاتەوە ، ئەو شوێنەیە کە گۆی زەوی تیایدا لە رەقەوە دەگۆڕێت بۆ شلە و شەپۆلەکانی (S) لەم نابەردەوامیەوە تۆمار ناکرێت. |
| ***Guyots*** | بەرزاییەکانی ژێر ئاستی دەریا |
| ***Gymnosperms*** | تۆو رووتەکان |
| ***Gyp rock*** | کەڤری گەچی: ئەو کەڤرە نیشتووەیە کە بە شێوەیەکی سەرەکی پێکهاتووە لە گەچ. |
| ***Gypseous*** | گەچی |
| ***Gypsum*** | گەچ: خاوێکی بڵاوەو پێکهاتووە لە گۆگرداتی کالسیۆمی ئاوی $CaSO_4 . 2H_2O$. بە گشتی پێکەوە لەگەڵ هالایت و ئەنهایدرایت دا دەبن. زۆر نەرمە (رەقێتیەکەی "2" لەسەر پێوەری موهس) رەنگی سپی یان بێ رەنگە لە کاتی پاکی دا وە رەنگەکەی دەگۆڕێت بۆ زەردباو و سوورباو و شینباو لە کاتی بوونی پیسیدا. بەشێوەی تۆپەڵ یان ریشاڵی یان کریستاڵی یەکلاریدا دەبێت. بەکاردێت بۆ گەچکاری و سپیکاری. |

# -Hh-

| ئینگلیزی | کوردی |
| --- | --- |
| *Habit* | شێوە |
| *Habitat* | ژینگە، دەورووبەر |
| *Hade* | گۆشەی لاری دابڕاو: ئەو گۆشەیەیە کە ڕوویەکی دروست بوو لەگەڵ ستووندا دروستی دەکات، بەشێوەیەکی ستونی لەسەر لێدەری ئەو دروست بووە دەپێورێت. |
| *Half life* | نیوە تەمەن :نیوە تەمەنی تیشك دانەوە ، تایبەتە بە خاوە تیشکدەرەکان . |
| *Halite* | هالایت، خوێی چێشت: خاوی NaCl، خوێیەکی پاکە بەشێوەی تۆپەڵ یان دەنکۆڵەی یان کریستالی شەشپاڵووی هەیە. تامی خوێی هەیە بەهەمان مانای Rack salt دێت. |
| *Hammer* | چەکوش |
| *Hand specimen* | نموونەی دەستی: بە نموونەی ئەو خاوانە یان کەڤرانە دەوترێت کە پڕ بە مشتێکن و بەکاردێت بۆ دیاری کردنی سیفاتە دەرەکییەکان. |
| *Hanging wall* | دیواری هەڵواسراو: بەشی سەرەوەی لێکدابڕاوە ،کە دەکەوێتە سەروو هێڵی لێکدابڕانەوە. |
| *Hard* | ڕەق، پتەو |
| *Hardness* | پتەوی، ڕەقی: بەرگری خاو بۆ رووشاندن ، یەکێکە لە سیفاتە فیزیاییەکانی خاوەکان بە گشتی پێوەری مۆهس لە دە خاو پێکهاتووە بەکاردێت بۆ بەراوردکردن . |
| *Harmonic folding* | نوشتاوەی یەککەوتوو |
| *Heat flow* | لێشاوی گەرمی : ونکردنی گەرمی لە رووی زەوییەوە . |
| *Heave (in a fault)* | بڕی جوڵەی ئاسۆیی: بەو بڕە جووڵە ئاسۆییە دەوترێت کە لێکدابڕاو دروستی دەکات. |
| *Heavy liquid* | شلە قورسەکان: بەو شلانە دەوترێت کە چڕیەکانیان زۆرە (وەك برۆمۆ فۆرم) وە بەکاردێت لە جیاکردنەوەی خاوەکاندا. |
| *Heavy minerals* | خاوە قورسەکان: بەوخاوانە دەوترێت کە کێشی جۆریان لە (2.89) زیاترە، وەك زرکۆن. |
| *Height gauge* | بەرزپێو |
| *Helicoidal* | لوول پێچی |
| *Hemi (half)* | نیوە (نیمچە) |

Hemi/Hing

| | |
|---|---|
| *Hemicolloid* | نیمچە مل |
| *Hemicrystalline* | نیمچە بلوور |
| *Hemi cycle* | نیمچە خول، نیمچە سووڕ |
| *Hemi morphism* | نیمچە شێوەیی |
| *Hemisphere* | نیوە گۆی زەوی |
| *Hetro coralla* | شیلانە گۆڕاوەکان |
| *Hetrodonts* | ددان لەیەک نەچووەکان: بەشێکن لە نەرمۆڵە دوو لەپکەییەکان کە ددانەکانیان لە ڕووی شێوەو قەبارەوە جیاوازن. |
| *Hetrogenity* | ناچوون یەکی |
| *Hetrognats* | شەویلگە لەیەک نەچووەکان |
| *Hetromorphic* | شێوە گۆڕاو |
| *Hetropical beds* | چینە هاوتەمەنە لەیەک نەچووەکان |
| *Hetrotaxial beds* | چینە ناهاوتەمەنە لەیەک نەچووەکان |
| *Hexacoralla* | شیلانە شەشییەکان |
| *Hexactinellida* | شەش تەوەرەییەکان |
| *Hexagonal system* | ڕژێمی شەشلا: یەکێکە لەو شەش ڕژێمە سەرەکییەی کە خاوەکان لەسەری دەبن بە کریستاڵ. دەناسرێت بە هەبوونی یەک تەوەرەی نایەکسان لەگەڵ سێ تەوەرە ئاسۆییە یەکسانەکاندا وە گۆشەی (120°) پێکدەهێنێت لەگەڵیاندا هاوێمەکییەکی سێی یان شەشی هەیە. |
| *Hexahedral* | شەش ڕوویەکان |
| *Hiatus* | بۆشایی کاتی، نەنیشتن: وەستانێك یان پچڕانێك لە بەردەوامی تۆمارگەی جیۆلۆجیدا. وەك وون بوونی چەند چینێك لە چینزانیدا کە لە ئاسای دا دەبوو هەبوایە، وون بوون بەهۆی ئەوەوە بێت کە لەوانەیە ئەو چینانە هەر لە بنچینەدا نەنیشتبن یان بەهۆی داماڵین و داخورانەوە نەمابن، بەگشتی بەکاردێت بۆ ئەو بۆشاییە کاتییەی کە نیشتن تیایدا نەبووە یان ڕاوەستاوە. |
| *Highlands* | بەرزاییەکان |
| *High tide* | هەڵکشان |
| *Hill* | گرد |
| *Hillock* | تەپۆڵکە |
| *Hinge* | جومگە:<br>1-لە چینە چەماوەکاندا، بەو خاڵە یان هێڵە دەوترێت کە گەورەترین چەمانەوەی تیادا هەیە.<br>2-لە بوویەردزانیدا، ئەو هێڵەیە کە لەپکەکان تیایدا پێکەوە دەنوسێن. |

| | |
|---|---|
| ***Hinge fault*** | دابڕاو یان لێکترازاوی جومگەیی |
| ***Histogram*** | لا کێشە شێوە |
| ***Histometabasis*** | گۆڕینەوەی بەشی |
| ***Historical geology*** | جیوٚلوٚجیای مێژوویی: بەو بەشە سەرەکیە دەوترێت لە زەوی ناسی کە لە گەشە سەندنی زەوی دەکۆڵێتەوە لە دروست بونیەوە تا ئێستا. |
| ***Hog back*** | هوگ باك : هەر بەرزاییەك کە لاکانی زۆر لێژ بێت و بەیەك پلە بێت ، بەرامبەر بە وشەی کوێستا دێت. |
| ***Holm*** | دورگەی ناو رووبار |
| ***Holocene*** | سەردەمی تازە: دوایین سەردەم لە ماوەی چواری دا لە چاخی ژیانی نوێدا. |
| ***Holocline*** | چینە یەکلارییەکان |
| ***Holocrystaline*** | بلووربوونی تەواو |
| ***Holotype*** | نموونەیی: ئەو تاکە نموونەیەیە کە دادەنرێت بە نموونەی پێوانەیی بۆ جۆرێك. |
| ***Homeomorphism*** | شێوە لێکچووەکان |
| ***Homoaxial folding*** | نوشتاوەی لەیەکچوو |
| ***Homocline*** | لاری لەیەکچوو: زاراوەیەکی گشتییە بۆ ئەو یەکە کەڤرییەی کە چینەکانی یەکلاریان هەیە، وەك باڵی چینە چەماوەیەك. |
| ***Homogenity*** | لەیەکچوون |
| ***Homognathes*** | شەویلگە لەیەکچووەکان |
| ***Homotaxial beds*** | چینە لەیەکچووە ناهاوتەمەنەکان |
| ***Homotaxis*** | هاویەکی چینەکان |
| ***Horizon*** | ئاسۆ، روو |
| ***Horizontal*** | ئاسۆیی |
| ***Horizontal projection*** | کەرتکای ئاسۆیی |
| ***Horizontal section*** | بڕگەی ئاسۆیی: دروستکردنی بڕگەیەکی ستوونی بۆ پێکهاتوویەکی جیولۆجی بە ئاڕاستەی هێڵێکی دیاریکراو، وێنەکردن لەسەر بناغەی ئەو زانیاریانەی کە لە نەخشەیەکی جیۆلۆجییەوە وەردەگیرێت یان هەر هۆیەکی تر. |
| ***Horn*** | شاخ |
| ***Hornfels*** | هۆرنفێلس: ئەو کەڤرەیە کە لە ئەنجامی گۆڕانی گەرماییەوە دروست دەبێت و دەنکۆڵەکانی وردن. |
| ***Horst*** | هۆرست: بەرزاییەکی درێژە کە ئەم لاو ئەو لای لێکدابڕاوە واتە بەهۆی لێکدابڕاوەوە دروست بووەو دژی وشەی Graben دێت. |

| | |
|---|---|
| ***Humidity*** | شێ |
| ***Humification*** | کرداری بە هیومایت بوون: بریتییە لە کرداری گۆڕانی مادەی هیومی یان ترشی هیومی بە تایبەتی بەهۆی بە ئۆکسید بوونی لەسەرخۆو هێواشەوە. |
| ***Humite*** | هیومایت: ئەو خەڵوزەیە کە بەهۆی کرداری **Humification** ەوە دروست دەبێت. زۆربەی زۆری جۆرەکانی خەڵوز لەم بابەتەیە. |
| ***Hyaline (hyaloid)*** | شوشەیی، روون |
| ***Hybrid*** | دوو رەگ: بەو تاکە دەوترێت کە باوانی دەگەڕێتەوە بۆ دوو جۆری جیاواز. |
| ***Hydration*** | ئاوێن : کردەی لەگەل ئاویەککگرتن |
| ***Hydraluic drilling*** | هەڵکەندن بەهێزی ئاو |
| ***Hydric*** | فرە شێیەکی |
| ***Hydrocarbon*** | هایدرۆکاربۆن: هەر ئاوێتەیەکی ئەندامی گاز یان شلە یان ڕەق بێت پێکهاتبێت لە هایدرۆجین و کاربۆن. |
| ***Hydrodynamics*** | هایدرۆ دایئەمیك |
| ***Hydrographic map*** | نەخشەی دابەشبونی ئاو |
| ***Hydrogeology*** | جیۆلۆجیای ئاوی: ئەو زانستەیە کە بەتایبەتی دەکۆڵێتەوە لە ئاوی ژێر زەوی. |
| ***Hydrology*** | زانستی ئاو: ئەو زانستەیە کە دەکۆڵێتەوە لە ئاوی کیشوەرەکان (رەق یان شل)، لەسەر رووی زەوی و ژێر زەوی و لەناو بەرگی هەوایدا و لە هەموو روویەکەوە. |
| ***Hydrolsopath*** | چەماوەی قوڵی یەکسان |
| ***Hydrolysis*** | ئاوێن : ئارەشیبوو نەوە یان ئاواندن : بە ئاوشیکردنەوە . |
| ***Hydrometry*** | رەوشتزانی شلە |
| ***Hydrophone*** | ئاوە بیستووك |
| ***Hydrosphere*** | بەرگی ئاوی یان ئاوە دەورووبەر : ئاوی گۆی زەوی لە هەرشوێنێکدا هەبێت و بەهەر شێوەیەك بێت. |
| ***Hydrospire*** | لوول پێچە ئاویەکان |
| ***Hydrostatics*** | هاوسەنگزانی شلەکان |
| ***Hydrothermal*** | ئاو گەرمەکی: زاراوەیەکی گشتییە بۆ هەر ئاوێکی گەرم (بەتایبەتی کە بنچینەکەی ماگما بێت) بەکاردێت. پەیوەندی بە کاریگەری ئاوە گەرمەکانەوە هەیە لە دروست بوونی کانەکاندا . |
| ***Hydrothermal deposits*** | نیشتووە گەرماییەکان: ئەو نیشتووانەن کە بەهۆی ئاوە گەرمەکانەوە دەنیشێت. |

Hydr/Hyst

| | |
|---|---|
| ***Hydrous*** | ئاوی |
| ***Hydrozoa*** | هایدروزوا: پۆلێکە لە هەناو ڕیخۆڵەییەکان لەماوەی کامبرییەوە دەرکەوتووەو تا ئیستا بەردەوامە. |
| ***Hydrograph*** | هێڵکاری باران بارین |
| ***Hygrometer*** | شێپێو |
| ***Hygrometry*** | شێپێوان |
| ***Hygrophytes*** | ئەو ڕووەکانەی کە لە شوێنی شێداردا دەژین. |
| ***Hygroscope*** | شێدۆز |
| ***Hygroscopic*** | شێدار |
| ***Hypabyssal*** | نیمچە قووڵ |
| ***Hyper*** | بەزۆری |
| ***Hyperpiestic water*** | چینە ئاوداری ئیتوازی |
| ***Hypo*** | بەکەمی |
| ***Hypocenter*** | تیشکۆی بوومەلەرزەی قووڵ |
| ***Hypocrystalline*** | کەم بە کریستاڵ بوون |
| ***Hypogene*** | ناوەکی |
| ***Hypotaxic deposit*** | نیشتووی ڕووکەشی (نیشتە ڕووکەش) |
| ***Hypothermal*** | هایپۆسێرمەڵ: بەو خاوە نیشتووە دەوترێت کە لە گەرماوەکانەوە کە قووڵییان زۆرەو پلەی گەرمایان لە نێوان 300–500 م° دروست دەبن. هەروەها بەو ژینگەیەش دەوترێت کە هەمان سروشتی هەبێت. |
| ***Hypothesis*** | گریمانە: ئەو بیرۆکەیەیە کەوا دانراوەو پێویستی بە تاقیکردنەوە هەیە، لە بیردۆزە بێهێزترە. |
| ***Hypothetical*** | گریمانی ، وادانان |
| ***Hypometer*** | بەرزیپێو |
| ***Hysteresis*** | بەرەو دوا |

# - Ii -

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| *Ice* | سەهۆڵ |
| *Ice age* | چاخی سەهۆڵ بەندان |
| *Ice avalange* | هە رە سی بە فری |
| *Ice barrier* | بەربەستی سەهۆڵی |
| *Ice bergs* | شاخی سەهۆڵی، بەفراوەر |
| *Ice- caps* | کڵاوەی سەهۆڵی |
| *Ice jam* | کۆمەڵبوونی سەهۆڵی |
| *Ice sheet* | بەرگی سەهۆڵی: بەو بەفراوەرە گەورەیە دەوترێت کە ئەستوورییەکەی زۆرەو پانتاییەکەی لە 50000کم$^2$ زیاترە و سەر رووی وشکانی داپۆشیوە. |
| *Ice storm* | رەشەبای سەهۆڵی |
| *Idiomorphic crystal* | کریستاڵی شێوە تەواو |
| *Igneous rocks* | کەڤری ئاگرین: بەو کەڤرانە دەوترێت کە لە ماگماوە دروست دەبن، کەڤرە ئاگرینەکان یەکێکە لەو سێ جۆرە کەڤرە سەرەکییەی گۆی زەوی. |
| *Ignitability* | توانای گڕگرتن |
| *Ignition* | گڕگرتن، داگیرسان |
| *Illumination* | رووناککردنەوە |
| *Image* | وێنە، دیمەن |
| *Imbedded* | بەناو یەکداچوو |
| *Imbricate structure* | پێکهاتوی سوار بوو |
| *Immature crystal* | کریستاڵی پێنەگەیشتو |
| *Immerse (Immerge)* | نوقم دەبێت |
| *Immersion liquid* | شلەی نوقمکەر |
| *Impact* | بەیە کا کەوتن |
| *Imperfect* | ناتەواو |
| *Imperforate* | بێکون |
| *Impermeable* | نەدەڵاندن |
| *Impermeable rock* | کەڤری نەدەڵێن |
| *Imporosity* | ناکونیلەدار |
| *Imporous* | نا کونیلەیی |

Impo/Indi

| | |
|---|---|
| *Impouding* | گلدانەوە |
| *Impregnate* | پڕ ئەبێتەوە |
| *Impregnation ore* | بەخام پڕبوونەوە |
| *Impression* | چاپ ، شوێنەوار : شێوەی بەجێماو لەسەر نیشتووە نەرمەکان "لم و قوڕ" لە ئەنجامی بەرکەوتنی هەر لەشێك بۆ ئەو رووە. وەك چاپی باران یان چاپی پێی گیانەوەران لەسەر چینە قوڕییەکان. |
| *Impulse* | هاندەر |
| *Impunctate* | بێکون |
| *Impurity* | ناپوختی |
| *Inactive* | ناچالاك |
| *Inarticulate* | پێبازووە بەیەکانەنووساوەکان: بەشێکن لە پێبازووەکان کە لە شوێنی جومگەدا ددان و بۆشایی نییە. |
| *Incandescent* | درەوشاوە |
| *Incarbonization* | بوون بەکاربۆن، بوون بە خەڵوز |
| *Incidents* | کەوتن |
| *Incipient* | لەسەرەتاوە |
| *Incised meander* | پێچی قووڵ |
| *Inclination* | لاری |
| *Inclinometer* | لاریپێو |
| *Inclusion* | خاوی بێگانە ، تیابوو |
| *Incoalation* | بوون بە خەڵوز |
| *Incompetent* | ناپتەو |
| *Incrustation* | دروست بوونی توێکڵ |
| *Index fossils* | بوو بەبەردە رابەرەکان: هەر بەبەردبوویەك کە تەمەنێکی جیۆلۆجی کەمی هەبێت و بڵاوبوونەوەیەکی جوگرافی فراوانی هەبێت و زۆر بێت و بە ئاسانی بناسرێتەوە. بەهەمان مانای Guide fossils دێت. |
| *Indicator* | پیشاندەر، نیشانە |
| *Indicatrix* | روونکەری چەماوە: لە زانستی بینایدا، ئەو شێوە ئەندازەییەیە کە دەربڕینی هاوکۆلکەی رووە کریستاڵیەکانی تیشکی شکاوەیە لە کریستاڵدا. |
| *Indices (Indices of the faces)* | بەڵگەکان، هاوکۆلکەی رووە بلووریەکان: هاوکۆلکەی رووە کریستاڵیەکان یان بەڵگەکان بریتییە لەو نیشانە، یان ئەو نرخە کورت کراوانەی کە لە ئەنجامی یەکتر بڕینی تەوەرە کریستاڵیەکانەوە بەدەست دەکەوێت بۆ هەر روویەك کە دەربڕینێکە لە شوێن و پەیوەندی تەوەرە کریستاڵیەکان. ژمارەی راستن و لە نێوان دوو کەوانەدا دەنووسرێت وەك (111). |

| | |
|---|---|
| ***Indissoluble*** | نەتواوە |
| ***Indistinct*** | نادیار |
| ***Indivisibility*** | توانای دابەش نەبوون |
| ***Induced seismicity*** | کارتێکردنی بوومەلەرزەیی |
| ***Induction*** | هاندان، کارتێکردن |
| ***Induration*** | رەقبوون: رەقبوونی مادە کەڤرییەکان بەهۆی کاری گەرمی یان پەستان یان هەندێك مادەی کۆنکرێتیەوە. |
| ***Inertia*** | تێپوانینی خۆیی |
| ***Infiltration*** | پاڵاوتن: کرداری رۆشتنی شلەمەنی بەناو کونیلەکانی ناو مادەدا. |
| ***Infinite*** | بێسنوور |
| ***Inflection*** | خوار بوونەوە |
| ***Inflow*** | ئاوەڕۆ |
| ***Influent*** | جۆگە |
| ***Infrastructure*** | پێکهاتووە قووڵەکان: هەر پێکهاتوویەك کە لە قووڵایدا دروست ببێت لەژێر پلەی گەرماو پەستانێکی زۆردا. |
| ***Infusible*** | شلنەبووەوە |
| ***Inhibition water*** | ئاوی خواردنەوە |
| ***Inhibitor*** | رێگر |
| ***Initial boiling point (I. B. P.)*** | پلەی کوڵانی سەرەتایی |
| ***Initial*** | سەرەتایی |
| ***Inject*** | لێیدەدات |
| ***Injection well*** | بیری لێدراو |
| ***Inlet*** | رێڕەگە |
| ***Inlier*** | کەڤری پەنگ خواردوو (قەتیس): رووبەرێکە یان کۆمەڵە کەڤرێکە کە دەورە دراوە بە دەرکەوتووی تازەتر لە خۆی. |
| ***Inorganic*** | نا ئەندامی |
| ***Insepage*** | لێچوون |
| ***Insecta*** | مێرووەکان: پۆلێکن لە پێجومگەییەکان کە دەناسرێن بەوەی سێ جووت قاچیان هەیەو لە هەندێکیاندا جوتێك باڵیش هەیە. |
| ***In situ*** | لە شوێن |
| ***Inselberg*** | دورگەی شاخی |
| ***Insert*** | دەتاخنێت |
| ***Insolation*** | داماڵین بە گەرمی خۆر |

*Inso/Inte*

| | |
|---|---|
| ***Insoluble*** | نەتواوە |
| ***Inspection*** | پشکنین |
| ***Instability*** | ناجێگیری |
| ***Instrument*** | ئامێر |
| ***Integrate*** | یەکدەخات |
| ***Intensity*** | تین، توندی |
| ***Inter bedded*** | چینبووی نێوانی |
| ***Intercalation*** | ناویەکچوون: چوونی چینێکی گڕکانی بە ناو چینی کەڤرە نیشتووەکاندا. |
| ***Intercept*** | کۆسپ |
| ***Interconnection*** | پێکەوە بەستن |
| ***Inter crystalline*** | بوون بە کریستاڵی نێوانی |
| ***Inter face*** | نێوانە روو: ئەو رووەیە کە دوو ناوچەی جیاواز لە رووی سیفاتە فیزیو کیمیاییەکانەوە جیادەکاتەوە. |
| ***Inter facial angle*** | گۆشەی نێوان دوو روو: لە بلووڕزانیدا، ئەو گۆشەیەیە کە دەکەوێتە نێوان دوو رووی کریستاڵیەوە. |
| ***Interference colour*** | رەنگی بەیەکاچوون: لە بینایزانیدا، ئەو رەنگەیە کە لە زۆربەی کریستاڵەکاندا لە باری تیشکی جەمسەرگراوی یەکتر بڕاودا دەردەکەوێت. ئەستووری و ئاڕاستەی نموونەکەو سروشتی تیشکی تێپەڕبوو کاردەکەنە سەر بەهێزی ئەم رەنگە. |
| ***Interference figure*** | شێوەی بەیەکاچوون: ئەو شێوەیەیە کە کریستاڵ دەینوێنێت لە تیشکی جەمسەرگیراودا لەژێر وردبیندا. پێکهاتووە لە چەماوە رەنگدارەکان و ئایسۆجایر (هێڵی رەش). |
| ***Inter folding*** | نوشتاوەی نێوانی |
| ***Inter glacial period*** | ماوەی نێوان دوو چاخی سەهۆڵ بەندان |
| ***Inter granular*** | نێوانە دەنکۆڵەییەکان |
| ***Interiomaginal*** | لێواری ناوەوە |
| ***Inter limb angle*** | گۆشەی نێوان دوو باڵ |
| ***Inter lock*** | پێکەوە دەبەستێ |
| ***Intermediate water*** | ئاوی ناوەندی |
| ***Inter mittent*** | پچڕ پچڕ |
| ***Inter mount*** | نێوانی شاخەکان |
| ***Internal moraine*** | سەهۆڵماڵکی ناوەکی |
| ***Intersection*** | یەکتربڕین |
| ***Interstice*** | بۆشایی |

| | |
|---|---|
| ***Intertidal region*** | ناوچەی هەڵکشان |
| ***Interval*** | ووچان |
| ***Intra*** | نێوانی |
| ***Intra tellurigue*** | لەناو زەوی |
| ***Intrinsic*** | خۆیی |
| ***Intruded*** | بیانی، بێگانە |
| ***Intrusion*** | بەناوچووەکان: ئەو کەڤرە ئاگرینەیە کە کەڤرەکانی لە خۆی کۆنتر دەبڕێت و لە قووڵایدا رەق دەبێت. |
| ***Intrusive body*** | تەنی بەناوچوو |
| ***Intumescence*** | هەڵئاوسان |
| ***Inverse*** | هەڵگەڕاوە، ئاوەژوو |
| ***Inversion*** | پێچەوانە کردنەوە |
| ***Invertebrate*** | بێبڕبڕەکان: ئەو کۆمەڵە گیاندارەن کە بڕبڕەی پشتیان نییە. |
| ***Involute*** | پێچ خواردوو |
| ***Involute shell*** | لەپکەی پێچ خواردوو |
| ***Ion exchange*** | ئاڵوگۆڕی ئایۆن |
| ***Ionic bond*** | بەندی ئایۆنی |
| ***Ionization*** | ئایۆنین، بوون بە ئایۆن |
| ***Ionosphere*** | بەرگی ئایۆنی |
| ***Iridescence*** | شیتەڵبوونی رووناکی |
| ***Iron*** | ئاسن: کانزایەکی قورسی موگناتیسیە تواناى لێدان و راکێشانی هەیە و لە رووی کیمیاییەوە چالاکە، خاوێنەکەی بریتییە لە توخمی (Fe). |
| ***Iron ores*** | ئاسنی خاو |
| ***Irregular*** | ناڕێك و پێك |
| ***Island arc*** | دورگەی کەوانەیی: زنجیرەیەك لە دورگە کە لە بنی قووڵایی دەریاکانەوە بەرز بۆتەوە نزیك کیشوەرەکان. |
| ***Isobars*** | هێڵی پەستان یەکسان |
| ***Isochore*** | ئایسۆ کۆڕ: ئەو هێڵەی کە لەسەر نەخشە دەکێشرێت لە نێوان ئەو خاڵانەی کە هەمان مارەی ستونیان هەیە لە نێوان دوو ئاستدا. دژی وشەی Isopach ە. |
| ***Isochrom*** | هێڵی رەنگیەکسان |
| ***Isochromatic*** | یەکڕەنگی |
| ***Isochrone*** | هاوتەمەن |
| ***Isoclinal*** | لارییەکسان: بەو چینە چەماوانە دەوترێت کە لاکانی یەکلاریان هەیە. |

Isod/Isot

| | |
|---|---|
| **Isodonts** | ددان لەیەکچووەکان: بەشێکن لە نەرمۆڵەکان کە دەناسرێن بەبوونی ددانی لەیەکچوو لە شوێنی جومگەدا. |
| **Isogam** | هێڵی هێزی موگناتیس یەکسان |
| **Isogeotherms** | یەکسانی گەرمایی زەوی |
| **Isogonics** | گۆشە یەکسان |
| **Isogyre** | ناوچەی ڕەش: لە بینایزانیدا، ئەو سێبەرەیە یان ئەو ڕەشێتیەیە کە بەشێکە لە شێوەی بەیەکاچوون. لەم شوێنەدا پێکهێنەرەکانی تیشك هەمان ئاراستەی لەرینەوەیان هەیەبۆیە شوێنەکە ڕەش دەنوێنێت لەژێر وردبیندا. |
| **Isohaline** | هێڵی سوێری یەکسان |
| **Isohyetal line** | هێڵی باران بارین |
| **Isolation** | لێکدابڕان |
| **Isometric chart** | هێڵکاری هاوڕێك |
| **Isomorphism** | هاوشێوە، هاوبلووربوون: بە دوو مادە یان زیاتر دەوترێت کە پێکهاتنی کیمیاییان جیاواز بێت بەڵام لەسەر هەمان ڕژێمی بلوور بوون بووبن بە کریستاڵ. |
| **Isomyaria** | ماسولکە یەکسانەکان |
| **Isopach** | هێڵی ئەستووری یەکسان: ئەو هێڵەیە کە لەسەر نەخشە وێنە دەکێشرێت ئەو خاڵانەی کە تیایاندا ئەستوورای یەکسانە بۆ یەکەیەکی جیۆلۆجی بەیەك دەگەیەنێت. دژی وشەی Isochors. |
| **Isopic bed** | چینە هاوشێوازەکان: بەو کەڤرە نیشتووانە دەوترێت کە هەمان شێوازیان هەبێت. |
| **Isopiestic** | فشار یەکسان |
| **Isopoda** | پێ یان قاچ یەکسانەکان: پۆلێکن لەو گیانەوەرانەی کە دەناسرێن بە نەبوونی لەپکە و هەبوونی چاوی جێگیر و لەشێکی پەستاو لە ماوەی ترایاسییەوە هەیە تا ئێستا. |
| **Isorads** | هێڵی یەکسانی چالاکی تیشك دان |
| **Isoseism** | هێڵی یەکسانی توندی بوومەلەرزە |
| **Isostasy** | هاوسەنگی توێکڵی زەوی: باری هاوسەنگی بۆ توێکڵی زەوی کە لەسەر کەوڵێکی پلاستیکی جێگیر بووە. |
| **Isostatic** | هاوسەنگ کردن |
| **Isostructure** | پێکهاتووە لەیەکچووەکان |
| **Isotherm** | هێڵی گەرمی یەکسان |

Isot/Item

**Isotope** — هاوتا: بەو توخمە کیمیاییە دەوترێت کە زیاتر لە یەک کێشی گەردیلەیی هەیە. ژمارەی پرۆتۆنەکانی ناو ناوک جێگیرە بەڵام ژمارەی نیوترۆنەکان دەگۆڕێت.

**Isotropic** — تایبەخۆ یەکسانەکان: بەو ناوەندانە دەوترێت کە رەوشتەکانیان یەکسانە (هەمان رەوشت) بە هەموو ئاراستەکاندا. دژی وشەی Anisotropic ە.

**Item** — بڕگە

# -J ژ-

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| *Jack hammer* | چەکوشی هەوایی |
| *Jag* | ددان |
| *Jagged* | ددانددار |
| *Jet* | فوارە |
| *Joint* | نێوانە روو (جۆینت): بەو شکانە دەوترێت لە کەڤردا کە لاکانی ئەو شکانە هیچ جووڵەیەکیان پێوە بەدیناکرێت. |
| *Joint system* | رژێمی نێوانە روو: بە دوو تاقم یان زیاتر نێوانە روو دەوترێت کە یەکتریان بڕی بێت. |
| *Jug* | لەرە پێو |
| *Junction* | بەیەکگەیشتن |
| *Jungle* | دارستان |
| *Jupiter* | هەسارەی بەرجیس: یەکێکە لە هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆر. |
| *Jurassic period* | ماوەی جوراسیك: ماوەی دووەمی چاخی ژیانی ناوەڕاست، لە دوای ماوەی ترایاسیکەوە و لە پێش ماوەی کریتاسییەوە دێت. بەناوی شاخەکانی جوراوە ناونراوە کە دەکەوێتە نێوان فەرەنساو سویسراوە. نزیکەی 190–195 ملیون ساڵ دەخایەنێت. |
| *Juvenile* | هەرزەکار، پێنەگەیشتوو |
| *Juvenile water* | ئاوی ماگمای: بەو ئاوە دەوترێت کە بڕوا وایە لە بنچینەدا لە ماگماوە دێت و یەکسەر دێتە سەر زەوی. |

# -Kk-

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| *Kainozoic era* | چاخی ژیانی نوێ (بڕوانە Cenozoic). |
| *Kanat* | دەربەند |
| *Kaolin* | قوڕی خاوێن، کائۆلین: ئەو خاوەیە کە بە شێوەیەکی سەرەکی لە قوڕی چینی پێکدێت، واتە لە خاوەقوڕییەکانە بەکاردێت لە پیشەسازی سیرامیکدا. پێکهاتووە لە سلیکاتی ئەلەمنیومی ئاوی. |
| *Karst* | کارست: جۆرێکە لە تۆپۆگرافی کە لە کەڤرە کلسی و دولۆمایت و جیپسۆم دا دروست دەبێت بەهۆی تواندنەوەوە، کە دەناسرێت بەهۆی بوونی کون و چاڵ و کەندڕەوە. ناوەکە لە هەرێمی کارستی شاخەکانی ئەلبی یوگسلافیای جارانەوە هاتووە. |
| *Katagensis* | قووڵە کردار (بڕوانە Catagensis) |
| *Keel* | تیغ: پێکهاتوویەکی شێوە پەراسووییە لە دیوی ژێرەوەی کۆنۆدۆنتدا. یان ئەو لێوارە تیژەیە لە دیوی دەرەوەی فۆرامدا. |
| *Kerogen* | کیرۆجین: مادەیەکی ئەندامی ڕەقی نەتواوەیە لە کەڤرە نیشتووەکاندا کە دەتوانرێت نەوتی لێدەربهێنرێت. |
| *Keriotheca* | شانە بەرگ |
| *Key bed* | ڕابەرە چین: چینێکی ناسراو و دیارە یارمەتی کرداری بەیەکگەیاندنی چینەکان دەدات لە شوێنە جیاوازەکاندا. |
| *Kick* | لەرزین |
| *Kinetic* | جوڵەیی |
| *Klippe* | خەلەند: ئەو کەڤرەیە کە بەتەنها ماوەتەوە و بەرگری داماڵین و داخوران دەکات. |
| *Knick point* | پنتی بەیەک گەیشتن: هەر خاڵێک کە تیایدا لێژی بگۆڕێت. |
| *Knoll* | سەکۆی شیلانی |
| *Knot* | گرێ |

# - L1 -

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| *Label* | نیشانە |
| *Labile* | نەسرەوت |
| *Labium* | لچ |
| *Labrum* | لێو |
| *Laccoliths* | لاکۆلیث: بەو کەڤرە ئاگرینییە شێوە گومەزیانە دەوترێت کە لە قووڵاییدا رەقدەبن و بنیان تا رادەیەك تەختەو، دەبنە هۆی ئەوەی کە چینەکانی سەرەوەیان خواریکەنەوەو بیانچەمێننەوە. |
| *Lacustrian* | دەریاچەیی |
| *Ladder vein* | دەماری پلە پلە کراو |
| *Lag deposits* | نیشتووی بەجێماو: کۆبوونەوەی ئەو نیشتووە زبرانەی کە پارچەی کەڤرە زۆر رەقەکانە لەبنی ئاوەڕۆدا دەمێنێتەوەو ئاوەکەیان هەوا ناتوانێت هەڵیان بگرێت لەبەر گەورەییان. |
| *Lagoon* | لاگوون: ئەو دەریاچەیەی کە زۆر قووڵ نییەو بەبەر بەستێکی مۆڵگەیی درێژکۆلەی تەسك لە دەریا جیاکراوەتەوەو ئاویە ناو ئاوی دەریا بەریەستەکە دەبڕێت و ئاوی دەداتێ، بەگشتی بەشێوەیەکی تەریب بە کەناری دەریاکان. |
| *Lake* | دەریاچە |
| *Lakelete* | زۆنگاو |
| *Lamella* | توێژاڵ |
| *Lamellibranchiate* | نەرمۆڵەکان |
| *Laminar* | توێژاڵ : ئەو چینەی کە ئەستوورییەکەی لە 1سم کەمترە. |
| *land* | وشکایی |
| *Land fall* | داڕمانی گڵی یان خۆڵی |
| *Land scape* | دیمەنی گشتی |
| *Land slide (land slip)* | داخزان: جوڵەی لەناکاوی خۆڵ یان چینە کەڤرەکان لەسەر رووبەکی لێژی زۆر. |
| *Land subsidence* | داچوونی زەوی |
| *Lane* | راڕەوی تەسك |
| *Latent* | شاراوە، مات |
| *Leteral aperture* | تەنیشتە کون |
| *Lateral erosion* | داخورانی تەنیشتی |

| | |
|---|---|
| *Laterite soil* | خۆڵی سوور: ئەو نیشتووە بەجێماوانەیە کە لە ژێر باردودۆخی ئاووهەوایەکی تایبەتدا دروست دەبێت لەناوچە گەرمەکاندا. پێکهاتووە لە ئۆکسیدی ئاسنی ئاوی هەروەها سلیکا و ئەلەمنیۆم بەشێوەی مادەی ئاسەرەکی تیایدایە. |
| *Latitude* | هێڵی پانی |
| *Lattice* | ریز بوونی کریستاڵی: یەکەی خانە |
| *Latic texture* | تنراوی تۆڕی |
| *Laurasia* | لۆراشیا: کیشوەرێکی کۆنە بریتی بوو لە ئەمریکای باکورو ئەوروپا و ئاسیاو سەرووی هیمالایا، پێش ئەوەی وەك ئێستا دابەش بێن. |
| *Lava* | لاڤا: زاراوەیەکی گشتییە بەکاردێت بۆ ئەو مادە کەڤرییە تواوانەی کە لە گڕکانەکانەوە دەردەچن و بەزۆری لە سلیکا پێکهاتوون. |
| *Law of superposition* | یاسای بەدوایەکهاتنی چینەکان: ئەو یاسایەیە کە دەڵێت لەو چینانەدا کە نەشێواون چینەکانی سەرەوە تازەترن لەوانەی کەلە ژێرەوەن، واتە چینە کۆنەکانی بەچینی تازە داپۆشراون لەهەر بەدوای یەکهاتنێکدا کە تێکنەچووین بەهۆی کارتێکەرێکەوە. |
| *Layer* | چینۆکە: ئەستوورییەکەی لە چین کەمترە. |
| *Layout* | نەخشە کێشان |
| *Lead ore* | خامی قورقوشم |
| *Leaf like structure* | پێکهاتووی گەڵا شێوە |
| *Leakage, Leak* | دادان |
| *Ledge* | لێواری موڵگە شیلانییەکان |
| *Lens* | سێلق، هاوێنە |
| *Lenticular* | هاوێنە شێوە |
| *Levee* | بەربەست |
| *Level* | ئاست |
| *Leveling* | رێککردن، تەختکردن |
| *Lever* | قۆڵ |
| *Ligament* | پێبەستی دەرەکی، شەپك، کاروان: ئەو پێکهاتووە کایتنییە لاستیکییە لە گیاندارە نەرمۆڵە دوولەپکەییەکاندا کە هەردوو لەپکەکە بەیەکەوە دەنوسێنێت. |
| *Lignite* | لیگنایت، خەڵوز: ئەو خەڵوزەیە کە رەنگەکەی رەش یان قاوەییەو پلەی بە خەڵوز بوونی زیاترە لە پیت و کەمترە لە خەڵوزی بیتیومینی. |

Limb/Load

| | |
|---|---|
| *Limb* | باڵ |
| *Lime* | کلس |
| *Limestone* | بەردی کلسی: کەڤرێکی نیشتووییە بەشێوەیەکی سەرەکی پێکهاتووە لە کاربۆناتی کالسیۆم (زیاتر لە 50٪ی کێش یان رێژەی سەدی لە ژێر وردبینەدا)، لەوانەیە کاربۆناتی مەگنیسیۆمیش بە رێژەی جیاجیا هەبێت. لە ئاوی پاك و دەریاکاندا دەنیشێت. لە بنچینەدا ئەندامی یان کیمیایی یان وردبوویە. |
| *Limit* | رادە، سنوور |
| *Linear* | هێڵی |
| *Linear folds* | نوشتاوە هێڵییەکان |
| *Linked* | بەستراو |
| *Linn* | تاڤگە |
| *Liquid* | شلە |
| *Liquid limit* | سنووری شلبوونەوە:کەمترین بڕی ئاوە کەزیاددەکرێت بۆ گڵێك کە تیایدا ئەو گڵە توانای جوڵەی هەیە وەك شلەکان. |
| *Lithification* | رەقبوون، بوون بە کەڤر: سەرجەم ئەو کردارانەیە کە دەبێتە هۆی رەقبوونی نیشتووەکان و بەکەڤربوونیان. |
| *Lithofacies* | شێوازی کەڤری، کەڤرە شێواز: کۆمەڵێ سیفاتی کەڤرییە کە تایبەتە بە ژینگەیەکی نیشتنی دیاری کراوەوە. یان ئەو شێوازەیە کە دەناسرێت و جیادەکرێتەوە لە کەڤرەکانی سەر و ژێری بەهۆی جۆری کەڤرەکەوە. بە دژی وشەی biofacies دێت. |
| *Lithogenesis* | زانستیبوون بە کەڤر |
| *Lithology* | زانستی سروشتی کەڤر |
| *Lithosphere* | بەرگی کەڤری: بەرگی رەقی دەرەوەی گۆی زەوی واتە توێکڵی زەوی پێکهاتووە لە سیاڵ و بەشی سەرەوەی سیما. |
| *Lithostatic pressure* | پەستانی چینە بەردەکان |
| *Lithostratigraphy* | چینزانی کەڤری: ئەو چینزانییە کە بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەر سیفاتە کەڤرییەکان و جۆری کەڤرەکان چینەکان دابەش دەکات. |
| *Littoral* | کەنار: ئەو ژینگەیەیە کە دەکەوێتە نێوان ئاستی هەڵکشان و داکشانی ئاوەوە. |
| *Live oil* | نەوتی خاو |
| *Load cast* | داڕێژگە قورسایی: کاتێك چینێکی لم لەسەر چینێکی قوڕ دەنیشێت لەمکە پاڵەپەستۆ و قورسایی دەخاتە سەر قوڕەکە، لەبەر ئەوە لە شێوەی چاڵدا قوڕەکە دەچێت بەناودا و پڕ دەبێت لە لم، پاش داخورانی قوڕەکە ئەو شێوەیەی دەمێنێتەوە پێی دەڵێن داڕێژگەقورسایی. |

| | |
|---|---|
| *Loam* | تێکەڵ، لووم: بەو خۆڵە دەوترێت کە پێکهاتووە لە تێکەڵەیەکی لیتەو لم و مەوادی ئەندامی. |
| *Lobe* | پل |
| *Local* | ناوخۆ |
| *Local anomaly* | ناوازەی ناوخۆیی |
| *Lode* | دەمار: شکاوییە کە لە کەڤردا کە پڕ دەبێتەوە بە مەوادی خاوی. |
| *Lodestone* | بەردی موگناتیسی |
| *Loess* | لوون، نیشتووی بایی: نیشتووی بایی چوون یەك پێکهاتووە لە مەوادی لیتەیی و لمی و دەوڵەمەندا بە کوارتز. |
| *Log* | لۆگ،تۆمار:بریتییە لە تۆمارکردنی ئەو چینە بەردانە یان ڕەوشتی ئەو چینە بەردانە وەك گەیاندن،بەرگری...هتد کە دەردەکەوێتبەهۆی هەڵکەندنی بیرێکەوە. |
| *Longitude* | هێڵی درێژی |
| *Loop* | گرێ |
| *Lopolith* | لۆپۆلیت: تەنێکی ئاگرییە کە ناوەڕاستەکەی بەشێوەی حەوزەو لە قووڵایدا ڕەق دەبێت. |
| *Lost volcano* | گڕکانی خامۆش |
| *Low* | نزم |
| *Low land* | نزمایی |
| *Lamachelle* | بەردە کلسی لەپکەیی |
| *Lump* | تۆپەڵ |
| *Lunar* | هەیڤی |
| *Luster* | بریسکە: بریتییە لە پلەی شکانەوەی تیشك لەسەر رووی‌خاو. یەکێکە لە سیفاتە فیزیاییەکانی کە بەکاردێت بۆ ناسینەوەی خاوەکان. لەو زاراوانەی کە بەکاردێت بۆ وەسفکردنی بریسکە: کانزای‌وناکانزایی (شوشەیی و رۆنی و ئاوریشمی و مۆمی...هتد). |
| *Lymnology* | زانستی دەریاچەکان |

# - Mm -

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| *Macalubas* | گڕکانی قوڕین |
| *Macle* | ریز بوونی بلووری |
| *Macrocrystalline* | بلووری گەورە |
| *Macrography* | لێکۆڵینەوەی پێکهاتووی کانزایی بەچاو |
| *Macro molecular* | گەردە گەورەکان |
| *Macroscopic* | دیار، بەچاو ئەبینرێ |
| *Macular rock* | کەڤری پەڵەدار |
| *Madrporia* | شیلانی بەردی |
| *Mafic mineral* | خاوە مافییەکان: بەو خاوانە دەوترێت کە لە پێکهاتنیاندا ئاسن و مەگنیسیۆمی تیادایەو بە گشتی رەنگیان رەشە. |
| *Magma* | ماگما: بریتییە لە مەوادی کەڤری تواوە لەناو زەویدا دروست دەبێت (توێکل یان بەشی سەرەوەی کەوڵ) بە رەقبوونی کەڤرە ئاگرینەکان دروست دەکات. |
| *Magma chamber* | ژووری ماگما |
| *Magmatic differentiation* | جیاکاری ماگماتی: هەر کردارێك کە ببێتە هۆی جیابوونەوەی ماگما بۆ پارچە ی جیاواز لە پێکهاتنی کیمیاییدا. |
| *Magmatic anomaly* | ئاوازەی موگناتیسی |
| *Magnetic azimuth* | گۆشەی تەوقە سەری موگناتیسی |
| *Magnetic bearing* | ئاراستەی موگناتیسی |
| *Magnetic declination* | لادانی موگناتیسی |
| *Magnetic dip* | لاری موگناتیسی |
| *Magnetic field* | کایەی موگناتیسی |
| *Magnetic flux* | لێشاوی موگناتیسی |
| *Magnetic needle* | دەرزی موگناتیسی |
| *Magnetic polarization* | جەمسەرگری موگناتیسی |
| *Magnetic variation* | گۆڕانی موگناتیسی |
| *Magnetometer* | موگناتیسپێو |
| *Magnetification* | گەورە کردن |
| *Magnitude (Earthquake)* | بڕی زەمین لەرزەیی |

Main/Mass

| | |
|---|---|
| ***Main*** | سەرەکی |
| ***Mainland*** | وشکایی |
| ***Malleable*** | کوتیو |
| ***Mammals*** | مەمکدارەکان یان گواندارەکان |
| ***Mantle*** | کەوڵ: ئەو بەرگەی زەوییە کە لە ژێر توێکڵەوە دێت و دەکەوێتە سەر کرۆکەوە، واتە دەکەوێتە نێوان هەردوو نابەردەوامی مۆهۆو گوتنبەرگەوە. لە نزیکەی قووڵایی 35کم وە دەست پێ دەکات تا 2900کم، وە دەکرێت بە چەند ناوچەیەکەوە. یان ئەو کەوڵەی کە دەوری لەشی نەرمۆڵەکان دەدات. |
| ***Manual*** | دەستی |
| ***Map*** | نەخشە: بریتییە لەو هێڵکارییە یان نواندنەی ڕووی زەوی یان بەشێك لە زەوی لەسەر ڕوویەکی تەخت بەپێی پێوانەیەکی دیاری کراو. وەك نەخشەی تۆپۆگرافی یان نەخشەی جیۆلۆجی. |
| ***Marble*** | بەردی مەڕ مەڕ[1]، ماربل[2]:<br>1-هەر بەردێك یان کەڤرێك کە لە ڕووی ئابوورییەوە سوودی هەبێت و توانای سافکردنی هەبێت و بەهێز بێت.<br>2-کەڤرێکی گۆڕاوە پێکهاتووە لە کریستاڵی ورد یان زبر لە کالسایت یان دۆلۆمایت کە دووبارە بە کریستاڵ بووبێتەوە. |
| ***Marble quarry*** | کانی مەڕ مەڕ |
| ***Marcasite*** | بەردە ئاگر: کانزایەکی بڵاوە ڕەنگێکی زەردی قاوەییباو یان خۆڵە مێشییە. لە ڕووی کیمیاییەوە پێکهاتووە لە $FeS_2$. |
| ***Marginal*** | کەناری، پەراوێزی |
| ***Marine current*** | تەوژمی دەریایی |
| ***Marine deposit*** | نیشتووی دەریایی |
| ***Marker bed*** | چینی ڕابەر: بەهەمان مانای **Key bed** دێت. |
| ***Marl*** | کلسی قوڕی |
| ***Mars*** | هەسارەی بارام: چوارەم هەسارەی کۆمەڵەی خۆر. |
| ***Marsh*** | زەلکاو |
| ***Marsh gas*** | گازی میثان |
| ***Matriculate*** | بەیەکانووساوەکان |
| ***Mass*** | بارستە، تۆپەڵ |
| ***Massive*** | تۆپەڵی: لە کەڤرەکاندا پێکهاتوویەکی چوون یەکە بە جۆرێك نەچین و نە پەڕەپەڕەی تیا بەدی ناکرێت. لە خاوەکاندا بریتییە لە تۆپەڵی کە نەبووە بە کریستاڵ. |
| ***Mass movement*** | بارستە جوڵە |

Mass/Meta

| | |
|---|---|
| ***Mass number*** | بارستە ژمارە |
| ***Material*** | مادە ،کەرەسە |
| ***Matrix*** | مادەی پێکەوە بەست، زەمینە |
| ***Mature*** | پێگەیشتوو |
| ***Maximum*** | بەرزترین، گەورەترین |
| ***Mean*** | ناوەڕاست |
| ***Meander*** | پێچاوپێچ |
| ***Measure*** | پێوانە، سەنگ |
| ***Measurement*** | پێوان |
| ***Mechanical weathering*** | کەشاندنی میکانیکی: ئەو جۆرەیە لە کەشاندن کە تیایدا هێزە فیزیاییەکان وەك بەستن و خاوبونەوەی ئاو و گەشەسەندنی کریستاڵی خوێ و گۆڕانی پلەی گەرما تیایدا زاڵە. دژی کرداری chemical weathering دێت. |
| ***Medicinal spring*** | کانیاوی کانزایی |
| ***Megascopic*** | دیار، بەچاو ئەبینرێ |
| ***Megaseism*** | زەمین لەرزەی بەهێز |
| ***Megaspore*** | گەورە هەڵاڵە |
| ***Melting point*** | پنتی شلبوونەوە |
| ***Member*** | ئەندام: بەشێکە لە پێکهاتوو دەناسرێت بە بوونی سیفاتی کەڤری دیاریکراو، یەکەیەکی چینزانی کەڤرییە. |
| ***Mercury*** | جیوە (Hg)یان هەسارەی ئاهی: یەکەم هەسارەی کۆمەڵەی خۆر. |
| ***Meridian*** | بازنەی هێڵی درێژی |
| ***Merosyncline*** | چینە چەماوەچاڵی ناوەندی |
| ***Mesh*** | مێش: کونی تۆڕە ، یەکسانە بە ژمارەی کونەکان لە ئینجێکی درێژیدا. یەکەی پێوانی بێژنگە. بۆ نموونە 20 مێش مانای وایە 20 کون هەیە لە ئنجێك دووجادا. |
| ***Mesohaline*** | نیمچە سوێر |
| ***Mesozoic*** | چاخی ژیانی ناوەڕاست: بەشێکە لە تەمەنی جیۆلۆجی لە دوای چاخی ژیانی کۆنەوە دێت و پێش چاخی ژیانی نوێ دەکەوێت، و لە چەند ماوەیەك پێکدێت. نزیکەی لە 225 ملیون ساڵ لەمەو پێشەوە دەست پێدەکات تا 65 ملیون ساڵ لەمەوبەر دەخایەنێت. |
| ***Metacrystal*** | بلوور یان کریستاڵی گۆڕاو |
| ***Metal*** | کانزا: بریتییە لەمەوادیسروشتی کە توانای توانەوەی هەیەو گەیەنەرێکی باشی کارەبایەو رەقە لە پلەی گەرمای ئاساییدا جگە لە جیوە نەبێت. دەناسرێت بە بوونی بریسکەیەکی کانزایی. |

Meta/Micr

| | |
|---|---|
| *Metallogenesis* | دروست بوونیخاوە کانزاییەکان |
| *Metamorphic aureole* | بازنەی گۆڕان یان ناوچەی گۆڕان |
| *Metamorphic differentiation* | جیاکاری گۆڕانی |
| *Metamorphic facies* | شێوازی گۆڕاو |
| *Metamorphic rock* | کەڤری گۆڕاو: بەشێکی سەرەکییە لە کەڤرەکان، بەو کەڤرانە دەوترێت کە بەهۆی گەرمایی و پاڵەپەستۆوە پێکهاتن و دروست بوونیان گۆڕاوە. وەك کەڤری نایس و شیست. |
| *Metamorphism* | گۆڕین: ئەو کردارانەیە کە دەبێتە هۆی گۆڕینی کەڤرەکان لە رووی پێکهاتن و دروست بوونیانەوە بەهۆی گەرمای و پاڵەپەستۆو کردارە کیمیاییەکانەوە. |
| *Metasomatism* | گۆڕینی خاوی: ئەو کردارانەی کە دەبێتە هۆی جێگرتنەوەی خاوێك بە خاوێکیتر کە جیاوازبێت لە پێکهاتنیدا. |
| *Metastable* | نیمچە جێگیر |
| *Metazoa* | گیاندارە فرە خانەکان |
| *Meteorite* | ئەیزەك، بەردە ئەستێرە : پارچە بەردێك یان کەڤرێك کە لە ئەستێرەکانی تری گەردوونەوە کەوتبێتە سەر زەوی. |
| *Meteorology* | کەشزانی |
| *Microclastic* | وردبووی ورد |
| *Microcrystalline* | بوون بە کریستاڵی ورد |
| *Micro earthquake* | زەمین لەرزەی بچوك |
| *Microfossils* | بووبەردە وردەکان: ئەو بووبەردانەیە کە هێندە بچوکن بەبێ بەکارهێنانی وردبین ناتوانرێت لێیان بکۆڵرێتەوە وەك فورامنیفێرا، بەرامبەرەکەی وشەی Macrofossils دێت. |
| *Micropaleontology* | زانستی بووبەردە وردەکان: بەشێکە لە بووبەردزانی تایبەتە بە لێکۆڵینەوەی بوو بەردە وردەکان. |
| *Micro pores* | وردبینە کون |
| *Micro porosity* | کونیلە وردەکان |
| *Microscope* | وردبین: ئامێرێکی بیناییە بەکاردێت بۆ بەدەست کەوتنی وێنەی گەورەی شتە بچوکەکان پێکهاتووە لە هاوێنەکان و شانۆ و هەڵگرو.. هتد، زۆر جۆری هەیەو بەکارهێنانی زۆرە. |
| *Microspore* | وردە هەلاڵە |
| *Micro structure* | پێکهاتووی ورد یان بچوك |

*Migm/Moho*

| | |
|---|---|
| ***Migmatite*** | میگماتایت، نیمچە ماگما: ئەو کەڤرەیە کە پێکهاتوە لە چینی لەدوای‌یەکی کەڤرەکانی گرانایت و شیست. |
| ***Migration*** | کۆچ کردن |
| ***Milky way*** | ڕێی کاکێشان |
| ***Miller indices*** | هاوکۆلکەی میللەر: بریتییە لە سێ یان چوار ژمارەی تەواو، بەکاردێت بۆ دیاریکردنی شوێن و ئاراستەی ڕووە کریستاڵییەکان، وەك (111). |
| ***Mine*** | کانگا: هەر چاڵێك لە ژێر زەویدا بۆ دەرهێنانی خاوەکان بەکاربهێنرێت. وەك کانگای خەڵوز. |
| ***Mineral*** | خاو: مادەیەکی سروشتی نا ئەندامی چون یەکی ڕەقە (جگە لە جیوە) پێکهاتنێکی کیمیایی دیاریکراو و ڕیزبونێکی گەردیلەیی و بلووری ڕێك و پێکی هەیە. |
| ***Mineral deposits*** | نیشتووە خاوییەکان |
| ***Mineralization*** | بوون بەخاو: زیادکردنی مادەیەکی‌خاوی بۆ هەر تەنێك یان کرداری جێگرتنەوەی مادەیەکی ئەندامی لە لایەن مادەیەکی خاوییەوە وەك لە بوون بەبەرددا. |
| ***Mineralogy*** | زانستی خاوەکان: ئەو زانستەیە کە لە خاوەکان دەکۆڵێتەوە لە ڕووی چۆنێتی دروست بوونیان و پۆلێنکردن و سیفاتەکانیان و شوێنی هەبوونیان. |
| ***Mineraloids*** | لەخاوچووەکان |
| ***Minimum*** | کەمترین، بچوکترین |
| ***Mining*** | کانگا کەندن |
| ***Mining geology*** | جیۆلۆجیای کانگاکان |
| ***Miocene*** | مایۆسین: سەردەمێکی سیانییە لە دوای ئۆلیگۆسینەوە وە پێش بلایۆسین دێت. |
| ***Miogeosyncline*** | مایۆجیۆسینکلاین: بەو جیۆسینکلاینە دەوترێت کە لە کاتی نیشتن دا چالاکی گڕکانی تیادا نییە. واتە ئەو بەشەی ئۆرسۆجیوسنکلاین کە گڕکانی تیادا نییە و نزیکە لە بەشی جێگیرەوە. |
| ***Miscibility*** | توانای تێکەڵ بوون |
| ***Mixer*** | تێکەڵکەر |
| ***Mixture*** | تێکەڵە |
| ***Mode*** | شێواز |
| ***Model*** | نموونە ، مۆدێل |
| ***Mohorovicic discontinuity*** | نابەردەوامی مۆهۆ: ئەو سنوورەیە کە تیایدا شەپۆلە بومەلەرزەییەکان بە کوتوپڕی دەگۆڕێن و دەکەوێتە نێوان توێکڵ و کەوڵی گۆی زەوییەوە. قووڵی ئەم نا بەردەوامییە لە ئۆقیانووسەکاندا لە نێوان 5–10کم دایەو لە ناوچە وشکانییەکان دا 35کم دەبێت و لە ناوچە زنجیرە شاخەکاندا دەگاتە 70کم. بەناوی زانای بەناوبانگی بوومەلەرزە زانەوە ئەندریا مۆهۆرۆڤیچەوە ناونراوە. |

| | |
|---|---|
| *Mohs/Mosa*<br>**Mohs scale** | پێوەری مۆهس: دەخاوی پێوانەییە لە رووی رەقێتییەوە. بە نەرمترین خاو دەست پێدەکات تا رەقترین خاوبەم شێوەیە: تالك، جپسیۆم، کالسایت، فلۆرایت، ئەپەتایت، ئۆرسۆکلیز، کوارتز، تۆپاز، کۆرەندەم و ئەلماس. |
| **Moisture** | شێ |
| **Molasse** | مۆلاس: زاراوەیەکی وەسفییە بەو شێوازە نیشتوانە دەوترێت کە دەناسرێن بە بوونی ئەستوورایییەکی زۆرو چینەکانی نەرم و چینبووی بڕاو نیشتووەکانی چەو لم و قوڕو مارلی تیادایە و دەوڵەمەندن بە بەردبوو. زیاتر نیشتووە ووردبووەکانی تیادایە لە فلێش و کەمتر رێك و پێك ترە. دژی وشەی فلێش دێت. |
| **Mold (Mould)** | چاپ: ئەو چاپەی کە لەپکە بەجێی دەهێڵێت لەسەر کەڤر لەوانەیە ناوەکی یان دەرەکی بێت. دژی وشەی دارێژگە دێت. یان ئەو چاڵەی کە لەسەر رووی نیشتووەکان دروست دەبێت. |
| **Mollusca** | نەرمۆڵەکان: پۆلێکن لە پۆلەکانی بێبڕبڕەکان. |
| **Momentum** | تەوژم |
| **Monoaxis** | یەکتەوەرەیی |
| **Monochromatic** | یەکڕەنگی |
| **Monoclinal** | یەکلاری: سیفەتێکی ئەو چینانەیە کە بەیەکلادا لارن، بەڵام یەکێك لەلاکانی چینەچەماوەی کوڕ یان چاڵ نییە. یان ئەو چینانەی کە هەمان ئاراستەیان هەیە. |
| **Monoclinic system** | رژێمی یەکلاری: یەکێکە لەو شەش رژێمەی کە مادەکان لەسەری دەبن بە کریستاڵ. سێ تەوەرەی نایەکسانی هەیە. |
| **Monocyclic** | یەکخولی |
| **Monogenesis** | یەکبنەچە |
| **Monomer** | گەردیلە سادەکان |
| **Monomineralic** | یەکخاوی: بەو کەڤرە دەوترێت کە لەیەك خاو پێکهاتووە. وەك کەڤری دۆنایت. |
| **Moon** | هەیڤ یان مانگ: تەنها دواکەوتەی هەسارەی زەوییە. |
| **Moraine** | سەهۆڵماڵك: ئەو بەرزاییەیە کە لە ئەنجامی نیشتنی ئەو نیشتووانەوە دروست دەبێت کە سەهۆڵ یان بەفراوەر دەیگوازێتەوە. |
| **Morenic debris** | وردبووی خەڵەندی |
| **Morphology** | شێوە زانی: شێوەی سەر رووی زەوی. |
| **Mosaic** | مۆزاییك: لەنیشتووەکاندا، تنراوێکە کە دەناسرێت بەوەی لە کەڤرە نیشتوە کریستاڵییەکاندا هەیەو لێواری دەنکۆڵەکان رێك و پێکە وەك لە دۆلۆمایتدا. |

| | |
|---|---|
| ***Moss*** | قەوزە |
| ***Mother rock*** | کەڤری دایك: ئەو کەڤرەیە کە کەڤرەکانی تر یان نیشتووەکان لایەوە دروست دەبن. بەهەمان واتای کەڤری سەرچاوە دێت. |
| ***Mottled*** | فرە ڕەنگی |
| ***Mountain*** | چیا، شاخ، کێو: هەر بەشێك لە توێکڵی زەوی کە بەرزتر بێت لە گرد، لەوانەیە بەتەنها یان لە شێوەی زنجیرەیەکدا هەبێت. بەگشتی دەبێت 300م بەرزتر بێت لە زەوی چواردەوری. |
| ***Mouth river*** | ڕێژگەی ڕووبار |
| ***Movement*** | جوڵە |
| ***Mud*** | قوڕ: تێکەڵەیەکە لە قوڕو لیتەی ڕەقنەبوو. |
| ***Mudstone (argillite)*** | کەڤری قوڕین: ئەو کەڤرە قوڕینەیەیە کە ڕەقەو بەڵام پەڕە پەڕە نییە. |
| ***Mud crack*** | درزی قوڕ: ئەو درزە نارێك و پێکە چەند لایەیە کە لە ئەنجامی هاتنەوەیەکی قوڕ دروست دەبێت. |
| ***Multimodal*** | فرە شێوەیی |
| ***Multiple*** | چەند جارە |
| ***Multipolar*** | فرە جەمسەر |
| ***Mural pores*** | کون دیوارییەکان |
| ***Mutation*** | بازدان: ئەو گۆڕانە کتوپڕانەیە کە لە بوونەوەراندا لە کاتی گەشەسەندندا ڕوو دەدات. |
| ***Mutual*** | ئاڵوگۆڕکراو |
| ***Mylonazation*** | تێکشکاندن |
| ***Myophore*** | ماسولکە هەڵگر |
| ***Myriapoda*** | فرە پێیەکان: بەشێکن لە پێنجومگیییەکان کە مێرووەکانیش دەگرێتەوە. زۆر بەکەمی وەك بەردبوو هەڵدەگیرێن. |

# -Nn-

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| *Nacr* | مرواری |
| *Nanofossils* | بەردبووە هەرە بچووکەکان وەك کۆکۆلیث کە بەبەردبووی زۆر بچوکی کلسین. |
| *Napes* | کەڤری نامۆ: تەنی گەورەن لە کەڤر کە لە شوێنی دروست بوونیانەوە گوێزراونەتەوە و لەسەر کەڤری تر جێگیر بوون، ئەمەش دەبێتە هۆی چەمانەوەی چینەکان بەشێوەیەکی گەورە و فراوان. |
| *Nape zone* | ناوچەی خشاو یان نامۆ |
| *Narrow* | تەسك |
| *Native element* | توخمی بێخەوش: هەر توخمێك کە لە سروشتدا بە تەنها هەبێت، ناکانزاکان وەك کاربۆن، گۆگرد و نیمچە کانزاکان وەك ئارسنیك و بزموث و کانزاکان وەك ئاڵتون و مس. |
| *Natural gas* | گازی سروشتی |
| *Natural levee* | بەربەستی سروشتی |
| *Natural selection* | هەڵبژاردنی سروشتی: ئەو کردارەیە کە بوونەوەران بەهۆیەوە دەپارێزرێن چونکە باشتر دەگونجێن لەگەڵ گۆڕانی دەوروبەردا. |
| *Near* | نزیك |
| *Nebular hypothesis* | گریمانی سەدیمی: گریمانەی دروست بوونی گەردوون لەلایەن لاپلاس لە ساڵی 1796دا دانراوە. وا دادەنێت کە لە پێش دا سەدیمێکی گازی گەورە هەبووە و پاش هاتنەوەیەکی خولاندنەوەی بۆ دروست بووە لەپاشاندا بۆتە هۆی دروست بوونی هەسارەکان و سوڕاندنەوەیان بەدەوری تەنی مەڵبەندی دا، خۆر. ئەم گریمانەیە لەبەر ئەوەی زەبری گۆشەی خۆر زۆر کەم بە ڕێژەی هەسارەکانەوە بۆیە وەلا نراوە. |
| *Nektons* | مەلەوانەکان: بەو گیانەوەرانە دەوترێت کە توانای مەلە کردنیان هەیە. |
| *Neogenesis* | دروست بوونی تازە |
| *Neomorphism* | دروست بوون: بەو گۆڕانانە دەوترێت کە لە نێوان خاو، خۆی یان هاوشێوەکانیدا ڕوودەدات، بەجۆرێك کریستاڵی دروست بوو گەورەتر یان بچوکتر بێت یان شێوەکەی جیاواز بێت لە کریستاڵی پێشوو. کردارەکانی هەڵگەڕانەوەو سەرلەنوێ بە کریستاڵ بوون دەگرێتەوە. یەکەم جار لەلایەن زانا فۆلك لە ساڵی 1965 دا بەکارهێنراوە. |

Neri/Numm

| | |
|---|---|
| *Neritic zone* | ناوچەی نێریتی: ئەو ناوچەیەیە لە دەریاکان کە قوڵییەکەی لە 200م تێپەڕ ناکات. |
| *Net slip* | پوختە لادان |
| *Net work* | تۆڕ، ڕژێم |
| *Nick* | قڵیش |
| *Nodular* | گرێی: تەنێکی بچوکی ڕەقی خڕ یان گۆیی نا ڕێك و پێکە لە خاوێك یان کۆمەڵە خاوێك پێکهاتووە. دەناسرێت بە بوونی پێکهاتنی جیاواز و ڕەقێتی گەورەتر لەو نیشتووانەی کە تیایدایە. وەك گرێی چێرتی لەناو بەردی کلسدا. |
| *Noise* | ژاوە ژاو |
| *Nomenclature* | ناونان |
| *Nominal* | ناوی |
| *Nonconformity* | نایەککەوتن: ئەو نایەککەوتنەیە کە لە نێوان کەڤری ئاگری لە ژێرەوەو کەڤرە نیشتووەکان لەسەرەوە دروست دەبێت، کاتێك ئەو ڕووە تووشی داماڵین و داخوران بووە پێش ئەوەی نیشتووەکان بنیشێت. |
| *Noncrystalline* | نەبوو بە کریستاڵ |
| *Nonmetal* | ناکانزایی |
| *Normal* | ئاسایی |
| *Normal fault* | لێکترازاوی ئاسایی: ئەو جۆرەیە لە لێکترازاو کە تیایدا دیواری هەڵواسراو بۆ خوارەوە دەجوڵێت بە ڕێژەی پێدیوارەوە. گۆشەی لێکترازاوەکە لە نێوان 45° – 90° دایە. |
| *Normal stress* | فشاری ستوونی: ئەو پێکهێنەرەی فشارە کە ستوونە لەسەر ڕوویەکی دیاریکراو. |
| *North* | باکوور، سەروو |
| *Nuclear* | ناوکی |
| *Nucleus* | ناوك |
| *Numerical* | ژمارەیی |
| *Nummulite* | نیومیولایت: هەر فۆرامینیفێرایەك بگەڕێتەوە بۆ خێزانی نیومیولایتید، دەناسرێن بە بوونی سەدەفەیەکی ڕووتەخت. |

# -Oo-

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| *Oasis* | مێرگ |
| *Oarpoidea* | دوو لا تەنك |
| *Objective* | بابەتی |
| *Oblate* | قوپاو |
| *Oblique* | لار |
| *Oblique extinction* | تاریك بوونی لار |
| *Obsidian* | شووشەی گڕکانی: کەڤرێکی شوشەی بەشی گڕکانییە، بەگشتی پێکهاتنی کیمیایی کەڤری رایولایتی هەیە، بریسکەکەی شوشەییەو شکانەکەی مەحارییە. |
| *Obstruction* | ڕێگرتن |
| *Obtuse bisectrix* | لەتکەری گۆشەی کراوە |
| *Occult mineral* | خاوی شاراوە |
| *Occurrence* | بوون |
| *Oceanic deposits* | نیشتووی ئۆقیانووسەکان |
| *Oceanography* | زانستی دەریاو ئۆقیانووسەکان |
| *Octahedron* | هەشتپاڵو،هەشتە ڕووە:تەنێك کە لە هەشت ڕوو پێکهاتبێت. |
| *Ocular* | چاوی |
| *Odorless* | بێبۆن |
| *Off lap* | نیشتووی گەڕانەوە: ئەو بارەی کە لە ئەنجامی کشانەوەی دەریاوە ڕوودەدات کاتێك نیشتووە کەنارییەکان لەسەر نیشتووە دەریاییەکان دەنیشێن. |
| *Offset* | لادانی ئاسۆیی |
| *Offshore bar* | بەربەستی کەناری: بەربەستێکی نزیك کەنارە ئاو دایپۆشیوە. |
| *Oil* | نەوت: بڕوانە Petroleum. |
| *Oil accumulation* | کۆبوونەوەی نەوت |
| *Oil basin* | ئاوزێڵی نەوتی |
| *Oil field* | چاڵگەی نەوت،نەوتە جاڕ،نەوتەڵان |
| *Oil sand* | لمی نەوت: بەهەر چینێك کە کوندار بێت دەوترێت کە نەوتی تیادا بێت. |
| *Oil shale* | کەڤری قوڕی نەوتی: کەڤرێکی ڕەش یان قاوەییە کە کیرۆجینی تیادابێت و هایدرۆکاربۆنی شل بەرهەم بێنێت.نەوتی بەشێوەیەکی سەربەست تیادا نییە. |

Olig/Opti

| | |
|---|---|
| **Oligocene** | ئۆلیگۆسین: سەردەمێکە لەسەردەمەکانی ماوەی سیانی لە دوای ئیۆسین و پێش مایۆسین دێت. |
| **Oligomiktic** | ئۆلیگۆمیکتیک: بەو کەڤرە وردبووە نیشتوانە دەوترێت کە لەیەک جۆر کەڤر دروست بوون. وەك چەوی ئۆرسۆکوارتزی. |
| **Olivine** | ئۆلیڤین: خاوێکەپێکهاتووە لە سلیکاتی مەگنیسیوم و ئاسن $(Mg, Fe)_2SiO_4$ رەنگەکەی زەیتونیەو لە کەڤرە ئاگرینە سەروو تفتەکاندا زۆرە. |
| **Ontogeny** | مێژووی ژیانی تاك: ئەو زنجیرە شێوە گۆڕانانەیە کە بریتییە لە گەشەی لەدوای یەك کە تاك پیایدا تێپەڕ دەبێت. |
| **Onyx** | بەردی سلێمان: جۆرێکە لە چالسیدۆنی چین چینە کە لە رەنگدا جیاوازن وەك رەش و سوور یان سوورو سپی بەڵام جیاوازە لە چالسیدۆنی بەوەی کە ئەم چینانە رێك و تەریبن بە یەکتر. |
| **Oolite, oolith** | ئۆئۆلایت: تەنێکی خڕی گۆی یان هێلکەییە لە کەڤرە نیشتوورییەکاندا. ناوکێکی هەیە، تیرەکەی لە نێوان 0,2 وە تا 0,5 ملم دایە. |
| **Oolitic limestone** | بەردە کلسی ئۆئۆلایتی |
| **Ooze** | ئوزز: بریتییە لە نیشتووی قووڵایی ئۆقیانووسەکان کە بەلانی کەمەوە لە 30٪ بریتییە لە پەیکەری بوونەوەرە پیلاجیکەکان، ئەوی تریشی کانزا قوڕییەکانە. بەناوی ئەو بوونەوەرەوە ناودەبرێت کە زۆری تیایە وەك Globigerina ooze. |
| **Opal** | بەردە شیری: خاوێکە (یان نیمچە خاوێکە) لە ئۆکسیدی سیلیکۆنی ئاوی دروست بووە $SiO_2\ nH_2O$ پێکهاتنی کریستاڵی نییە و رەنگی زۆرە. |
| **Opaque** | نووتەك: بەو ماددەیە دەوترێت کە رێگا بە تێپەڕ بوونی تیشکی بینراو نادات پیایدا. |
| **Operculume** | سەرپۆش |
| **Ophiolite** | ئۆفیۆلایت: کۆمەڵێك لە کەڤرە ئاگرییە تفتەکان و سەروو تفتەکانی لە سبیلایت و بازلت تا گابرۆ و پیریدۆتایت هەروەها سەربنتین و کلۆرایت. دروست بوونی هاوکاتە لەگەڵ گەشەکردنی جیۆسنکلایندا. |
| **Ophitic texture** | رەشتەی ئۆفیتی: تنراوێکی تایبەتە بە کەڤرە ئاگرینەکانەوە دەناسرێت بە بوونی کریستاڵی بلاجیۆکلیز لەناو کریستاڵی وردی پایرۆکسیندا. |
| **Optical** | بینایی |
| **Optic axis** | تەوەرەی بینایی |

| | |
|---|---|
| ***Optimum*** | گونجاوترین |
| ***Orbicular*** | گۆیی |
| ***Orbit*** | خولگە |
| ***Order*** | هۆز |
| ***Ordinary*** | ئاسایی |
| ***Ordinary light*** | ڕووناکی ئاسایی |
| ***Ordinary ray (O- ray)*** | تیشکی ئاسایی: لە کریستاڵە یەک تەوەرەییەکان دا، ئەو تیشکەی کە لەرەکەی ئەستوونە لەسەر تەوەرەی بینایی بەرامبەر وشەی E- ray دێت. |
| ***Ore*** | خام: کۆبوونەوەی خاوێک یان چەند خاوێک بەشێوەیەکی سروشتی کە نرخێکی ئابووری هەبێت لە کاتی دەرهێنانیدا. |
| ***Organic*** | ئەندامی |
| ***Organization*** | ڕێکخراو |
| ***Organism*** | بوونەوەر یان زیندەوەر |
| ***Orientation*** | ئاراستەکردن |
| ***Origin*** | بنەچە |
| ***Ornamentation*** | نەخش: بریتییە لەو نەخش و نیگارەی لەسەر لەشی گیانداران هەیە. بۆ نموونە ئەو دیاردانەی لەسەر ڕووی دەرەوەی بەشە ڕەقە هەڵگیراوەکان هەیە وەک بوونی دڕک. |
| ***Orogeny (orogensis)*** | دروست بوونی شاخەکان: ئەو کردارانەیە کە دەبێتە هۆی دروست بوونی شاخەکان. ئێستا هەموو ئەو کردارانە دەگرێتەوە کە لەناو شاخەکاندا ڕوودەدات و دەبێتە هۆی دروستبوونی چەمانەوەو لێکدابڕان و خشان و گۆڕانی کەڤرەکان. |
| ***Orogenic cycle*** | خولی دروست بوونی شاخەکان |
| ***Orogenic movement*** | جوڵەی شاخ دروستکەر |
| ***Orology*** | زانستی شاخەکان |
| ***Orthoclase*** | ئۆرسۆکلیز: یەکێکە لەخاوەکانی کۆمەڵەی فلدسپاری ئەلکالی، بێڕەنگ، یان سپی یان گۆشتییە پێکهاتنی کیمیایی $KAlSi_3O_8$. |
| ***Orthogeosyncline*** | ئۆرسۆجیۆسینکلاین: ئەو جیۆسنکلاینەیە کە دەکەوێتە نێوان جێگیرە وشکانییەکان و ئۆقیانووسەکانەوە. هەردوو بەشی گڕکانی (ئیۆجیۆسنکلاین) و ناگڕکانی (مایۆجیۆسنکلاین) دەگرێتەوە. |
| ***Orthogonal*** | ستوونی |
| ***Orthopetra*** | باڵڕاستەکان |

Orth/Ozon

| | |
|---|---|
| **Orthorhombic system** | رژێمی لەبزینەیی: یەکێکە لەشەش رژێمەکەی بەکریستاڵ بوون، دەناسرێت بەهەبوونی سێ تەوەرەی نایەکسان بەلام لەسەر یەك ستوون. |
| **Oscillation** | لەرینەوە ، دوولالەرە |
| **Oscilloscope** | لەرینەوەبین |
| **Osculum** | دەم: بەو کونە گەورەیە دەوترێت لە ئیسفنجەکاندا کە لێوەی ئاوی ناو ئیسفنجەکە دێتە دەرێ. |
| **Ostracoda** | ئۆستراکۆدا: ژێر پۆلێکە لە توێکڵدارەکان، دەناسرێت بە بوونی دوو لەپکە. زوربەیان وردن درێژیان لە نێوان 0.4 تا 1.5 ملم دەبێت، هەروەها ئەوانەی لە ئاوی پاکدا دەژین دەگەنە 5 ملم بەلام ئەوانەی لە دەریاکاندا دەژین دەگەنە 30 ملم. لە ماوەی خوارەوەی کامبرییەوە هەیە تا ئێستا بەردەوامە. |
| **Outburst** | تەقینەوە |
| **Outcrop** | دەرکەوتوو: ئەو بەشەیە لە پێکهاتووی جیۆلۆجی کە لەسەر رووی زەوی دەرکەوتووە. |
| **Outer** | دەرەکی |
| **Output** | دەرئەنجام، دەرچووەکان |
| **Out shoot** | دەرپەڕیو |
| **Over fold** | چینە چەماوەی هەڵگەڕاو (بڕوانە Overturned fold) |
| **Over lap** | نیشتووی پێشەوە چوو: زاراوەیەکی گشتییە بەکاردێت بۆ وەسفکردنی پەیوەندی چینەکان لە کاتی بەرەو پێش چوونی دەریادا، لەکاتێکدا چینە تازەکان لەسەر چینە کۆنەکان دەنیشێن. |
| **Over thrust (thrust fault)** | دابـڕاوی خشــاو: لێکدابڕاوێکــە پلــەی لارییەکــەی کەمــەو رووبەرەکەی گەورەیەو چالاکی دیواری هەڵواسراو زۆرەو دەبێتە هۆی دروست بوونی لادانێکی گەورە. |
| **Overturned fold** | چینە چەماوەی هەڵگەڕاو: ئەو چینە چەماوەیە کە تەوەرەکەی بەشێوەی ستوونی نییە. |
| **Ox- bow lake** | دەریاچەی کەوانەیی: بریتییە لەو دەریاچە شێوە مانگییەی کە ئاوەکەی وەستاوەو دەکەوێتە تەنیشتی ئەو جۆگەیەوە کە رووبارەکە شوێنەکەی گۆڕیوە. |
| **Oxidation (Oxidization)** | بە ئۆکسید بوون ، ئۆکساندن |
| **Ozone** | ئۆزۆن |

# -Pp-

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| *Packing* | پێچانەوە، ریزبوون: چۆنێتی ریزبوونی دەنکۆڵە رەقەکانی نیشتوو یان کەڤرێکی نیشتوو. |
| *Paired terraces* | پێپلیکانە رووبارییە جووتەکان |
| *Paleo-* | کۆن : پێشگرێکە بە مانای کۆن دێت. |
| *Paleobotany* | زانستی رووەکی کۆن |
| *Paleocene* | پالیۆسین: یەکەم ماوەی سیانییە لە ستوونی جیۆلۆجیدا. |
| *Paleocurrent* | تەوژمی کۆن |
| *Paleoclimatology* | کەشناسی کۆن |
| *Paleogeography* | زانستی جوگرافیای کۆن |
| *Paleontology* | بووبەرد زانی، بەبەردبووزانی : لێکۆڵینەوەی ژیان لەماوە جیۆلۆجییە ڕابردووەکاندا لەسەر بنەمای بووبەردەکان رووەکی یان گیانەوەری بێت. |
| *Paleosole* | خۆڵی کۆن |
| *Paleozoic era* | چاخی ژیانی کۆن: یەکێکە لە چاخەکانی جیۆلۆجی لە دوای پریکامبرییەوە دەست پێ دەکات تا سەرەتای چاخی ژیانی ناوەڕاست. |
| *Paleoecology* | ژینگەزانی کۆن: بریتییە لە لێکۆڵینەوە سەبارەت بە پەیوەندی نێوان بوونەوەران و ژینگەکەیان، لەسەر بنەمای بووبەردەکانی ستوونی جیۆلۆجی و شوێنی ئەم بوو بەردانە لە چینەکاندا. |
| *Paleomagnatism* | موگناتیسی کۆن |
| *Palingensis* | تیۆری لەبەرگرتنەوە:<br>1–لە بووبەرد زانیدا بەمانای لەبەرگرتنەوەی نەوەی بوونەوەران واتە بەبێ هیچ گۆڕانێك لە باوانەوە.<br>2–لەکەڤرزانیدا دروست بوونی ماگمای نوێ بەهۆی توانەوەی کەڤرەکان. |
| *Palinspactic map* | نەخشەی پێش شێواندن |
| *Palynology* | پالینۆلۆجی: ئەو بەشەیە لە زانستی بوو بەردزانی کە دەکۆڵێتەوە لە بووبەردە ئەندامییەکان وەك سپۆرو پۆلێن و ئەکریتارك و ...هتد. |
| *Pan* | تاوە |

| | |
|---|---|
| *Pangaea* | پانجیا، دایکی کیشورەکان: یەکەم بنچینەی کیشوەرەکان، وا بڕوا دەکرێت کە کیشوەرەکان لەمەوە (پاش پارچە پارچەبوونی) دروست بوون. هەردوو کیشوەرە گەورەکان لۆراشیاو گوندوانا دەگرێتەوە. |
| *Panthalassa* | پانثالاثا: یەکەم ئۆقیانووس، وا بڕوا دەکرێت کە دەوری یەکەم کیشوەری (پانجیا) دابێت، پاش جیابوونەوەی کیشوەرەکان پارچە پارچە بووە بۆ ئەم ئۆقیانووسانەی ئێستا. |
| *Parabola* | هارتا بڕگە |
| *Paraconformity* | نیمچە یەککەوتوو |
| *Paragensis* | دروست بوون یان کۆبوونەوەی خاو |
| *Parageosyncline* | پاراجیۆسینکلاین: ئەو جیۆسنکلاینەیە کە دەکەوێتە ناو جێگیرەوە یان ناوچە جێگیرەکانەوە. زیاتر بەهۆی جوڵەی ستوونییەوە دروست دەبێت. |
| *Parameters* | هارکۆلکەکان |
| *Paramorph* | شێوە گۆڕاو |
| *Parent material* | مادەی بنەچەیی |
| *Partial* | بەشی |
| *Partial regression* | گەڕانەوەی بەشی |
| *Particle* | تەنۆلکە |
| *Particle size* | قەبارەی تەنۆلکە: بەگشتی دوورییەکانی تەنۆلکەو دەنکۆڵەکانی نیشتوو یان کەڤرەکان دەگرێتەوە وەك تیرە یان قەبارە. زیاتر بەهۆی بێژنگەوە دیاری دەکرێت یان بەهۆی خێرای نیشتن و یان لە وردبینەوە هەروەها دەژمێردرێت. |
| *Parting* | لێك جیابوونەوە |
| *Path* | ڕێڕەو |
| *Pattern* | شێواز، نموونە |
| *Pay zone* | ناوچەی بەرهەم هێن |
| *Peak* | لوتکە |
| *Pearl* | مرواری |
| *Peat* | خەڵوز (پیت): پاشمارەی رووەکی رەق نەبووی هێشتا بە تەواوی نەبووە بە کاربۆن و ڕێژەیەکی زۆر ئاوی تیادایە. دادەنرێت بەیەکەم پلەکانی بوون بە خەڵوز. لە زەلکاوەکاندا دروست دەبێت. |
| *Pebble* | چەو: زاراوەیەکی گشتییە بۆ ئەو بەردە بچوکە خڕانەی کە تیرەکەیان لە نێوان 4-64 ملم دایە. بەهەمان ماناى gravel دێت. |

Pedi/Peri

| | |
|---|---|
| **Pedicle** | مل |
| **Pedicle valve** | ملە دەروازە |
| **Pedogensis** | دروست بوونی خۆڵ |
| **Pedology** | خۆڵزانی، زانستی خۆڵ: ئەو زانستەیە کە تایبەتە بە لێکۆڵینەوەی خۆڵ لە رووی بنچینەو سیفاتەکان و بەکارهێنانەکانییەوە. |
| **Pegmatite** | پێگماتایت: ئەو کەڤرە ئاگرینانەیەکە دەنکۆڵەکانی زۆر گەورەن و بەگشتی لەو ستونانەدا هەیە کە چینەکانی تر دەبڕێت. پێکهاتنی کیمیایی نزیکە لە گرانایتەوە. |
| **Pelagic** | پیلاجی: سیفەتێکی ئەو بوونەوەرانەیە کە لەناو ئاوی دەریاکاندا مەلەدەکەن یان سەرئاو ئەکەون بۆ ئەوەی جیابکرێتەوە لەوانە کە لەبنی دەریاکاندا دەژین. هەروەها بەکاردێت بۆ جیاکردنەوەی ئەو نیشتووانەی کە لە بنچینەدا دەریاین لەو نیشتوانەی کە لە وشکانییەوە دێن. |
| **Pelecypoda** | پێتەورییەکان: پۆلێکن لە نەرمۆڵەکان، دەناسرێن بە بوونی پەیکەرێك کە پێکهاتووە لە دوو لەپکەی تەنیشتە هاویەك. |
| **Pelitic** | قوڕی |
| **Pellet** | پیلیت ،پشقل:دەنکۆڵەی خڕ یان هێلکەی نیشتووە یان کەڤرەکانە، بە گشتی لە کاربۆناتی کالسیۆم پێکهاتووە، تیرەکەی لە نێوان 0.1 ملم تا 5 ملم دەبێت. هەروەها پیلیتی فۆسفاتیش هەیە. |
| **Pellucid** | نیمچە روون |
| **Pelnatozoaires** | جێگیربووەکان |
| **Peneplane** | ئاستی کۆتایی داماڵین |
| **Penetration** | ددان، سمین |
| **Peninsula** | نیمچە دورگە |
| **Pentagon** | پێنجلا |
| **Percentage** | رێژەی سەدی |
| **Perched** | هەڵواسراو |
| **Percolating water** | ئاوی پاڵێوراو |
| **Percussion** | هەڵکەندن بە لێدان |
| **Perfect** | تەواو |
| **Perforated** | کونکراو |
| **Pericline** | گومەز |
| **Perigee** | پێرجی: ئەو خاڵەی کە گۆی زەوی تیایدا نزیکترین دووری هەیە لە تەنێکی ئاسمانییەوە وەك مانگ. |

*Peri/Petr*

| | |
|---|---|
| ***Perimeter*** | چوارچێوە |
| ***Perennial streams*** | رووبارە هەمیشەییەکان |
| ***Period*** | ماوە: یەکەیەکی پێوانی کاتی جیۆلۆجییە، لە چاخ بچوکترو لەسەردەم گەورەترە. وەك ماوەی تەباشیری یان ترایاسیك.. |
| ***Peripheral*** | چوارچێوەیی |
| ***Peristome*** | دەوری دەم (پیریستۆم): ئەو ناوچەیەیە کە دەوری دەم دەدات لە زۆر لەبێبڕبڕەکاندا، وەك ئەوەی کە دەوری دەم دەدات لە پێست دڕکاویەکاندا. |
| ***Perilite*** | شوشەی گڕکانی: شوشەی گڕکانی هەمان پێکهاتنی کیمیایی رایولایتی هەیە، بەگشتی رێژەی ئاوی زیاترە وەك لە ئۆپسیدیان. |
| ***Permanent*** | بەردەوام ، هەمیشەیی |
| ***Permeability*** | دەڵاندن: سیفەتی توانای کەڤرە کوندارەکانە بۆ رۆیشتنی شلە پیایاندا. |
| ***Permeation*** | دادان |
| ***Permian*** | پێرمی: دوایین ماوەی چاخی ژیانی کۆنە، لەدوای ماوەی کاربۆنی‌یەوە دێت. بەناوی ناوچەی پێرمی رووسیاوە ناونراوە کە یەکەم جار کەڤرەکانی ئەم تەمەنە خوێندراوە. |
| ***Perpendicular*** | ستوونی |
| ***Persistent*** | بەردەوام، هەمیشە |
| ***Pervious rock*** | کەڤری دەڵاو |
| ***Petrification*** | بوون بە بەرد: کرداری بەبەردبونی مادەی ئەندامی بە جێگرتنەوەی مادەی خاوی (وەك کاربۆناتی کالسیۆم) لەجێی شانە ئەندامییەکان. هەمان شێوەی پێشوو دەپارێزرێت. |
| ***Petrophabric analysis*** | شیکردنەوەی تنراوی |
| ***Petrofcies (Petrographic facies)*** | شێوازی کەڤری: ئەو شێوازانەیە کە جیاکردنەوەو ناسینەوەیان لەسەر بنەمای پێکهاتنیانە نەك شێوەو سنووریان. |
| ***Petrogensis*** | دروست بوونی کەڤرەکان: ئەو بەشەیە لە کەڤرزانی کە لە بنچینەو دروست بوونی کەڤرەکان بەتایبەتی کەڤرە ئاگرینەکان دەکۆڵێتەوە. |
| ***Petrography*** | پیترۆگرافی: ئەو بەشەیە لە جیۆلۆجی کە تایبەتە بە وەسفکردن و پۆلێنکردنی کەڤرەکان، بەهۆی بەکارهێنانی وردبینەوە. |
| ***Petroleum*** | نەوتی خاو: شلەیەکی هایدرۆکاربۆنی ئاڵۆزی سروشتییە کە لەوانەیە خەوشی تیابێت وەك گۆگرد و نایترۆجین. |

Petr/Phyl

| | |
|---|---|
| *Petroleum geology* | جیۆلۆجیای نەوت: ئەو بەشەیە لە جیۆلۆجیای ئابووری کە لە بنچینەو دروست بوون و کۆچکردن و کۆبوونەوەو دەرهێنانی هایدرۆکاربۆنەکان دەکۆڵێتەوە بەهاوبەشی لقەکانی تری جیۆلۆجی وەك جیۆفیزیا و جیۆکیمیا و بووبەردزانی و چینزانی و... هتد. |
| *Petroliferous* | نەوتی |
| *Petrology* | کەڤرزانی: ئەو بەشەیە لە زەویناسی کە لە بنچینەو دروست بوون و پێکهاتن و بوون بە مێژووی کەڤرەکان دەکۆڵێتەوە. فراوانترە لە پیترۆگرافی کە ئەمەی دوای لە سیفەتەکان و پۆلێن کردنی کەڤرەکان دەکۆڵێتەوە. |
| *Phacoidal* | هاوێنەیی |
| *Phacolith* | فاکۆلث: ئەو کەڤرە گرانایتییە هەردوو دیو قۆقز یان یەك دیو قۆقزەیە کە قەبارەکەی گەورەیەو لەناو چینە چەماوەکاندا هەیە یان لە لوتکەی چینە چەماوە کوپەکان یان لەبنی چینە چەماوە چاڵەکاندا . |
| *Phanerocrystalline* | بوون بە کریستاڵی دیار: کەڤرێکە کە کریستاڵەکانی بەچاوی ئاسای دەبینرێت. |
| *Phanerozoic Eon* | چەرخی دەرکەوتنی ژیان: ئەو بەشەیە لە کاتی جیۆلۆجی کە تیایدا بەڵگەکانی ژیان زۆر بڵاوە واتە لە کەڤرەکانی ئەم کاتە دا بووبەردی زۆر بەدی دەکرێت. |
| *Phase* | قۆناغ |
| *Phenocryst* | کریستاڵی دیار: بەو کریستاڵە گەورانە دەوترێت کە لە کەڤرێکی پۆرفیریدا هەیە. |
| *Phenomenon* | دیاردە |
| *Phosphate* | فۆسفات |
| *Phosphorite* | فۆسفۆرایت: کەڤرێکی نیشتوویە پێکهاتووە بەشێوەیەکی سەرەکی لەخاوە فوسفاتیەکان. بەشێوەی چین چینە و کریستاڵی کاربۆناتی فلۆرنەپەتایت بڵاوە. هەروەها بەو کەڤرە دەوترێت کە هەمووی لە ئەپەتایت پێکهاتووە. |
| *Photogeology* | جیۆلۆجیای وێنەیی: جیاکردنەوەو ناسینەوەو لێکۆڵینەوەی دیاردەجیۆلۆجییەکان بەهۆی وێنەوە بەتایبەتی وێنەی ئاسمانی. |
| *Photosynthesis* | رۆشنە پێکهاتن |
| *Phreatic (Ground water)* | ئاوی ژێر زەوی |
| *Phylum* | لق: یەکەیەکی گەورەی پۆلێن کردنی گیانەوەرانە لە پۆل گەورەترەو لە شانشین بچوکترە. |

Phys/Pitc

| | |
|---|---|
| ***Physiographic*** | بەرزونزمی |
| ***Phytogenic*** | بنەچە رووەکی |
| ***Phytoplankton*** | سەرئاو کەوتووە رووەکییەکان: ئەو سەرئاوکەوتووانەی کە لە بنچینەدا رووەکین وەك دایەتۆم. بەرامبەر وشەی Zooplankton دێت. |
| ***Phytology*** | رووەکزانی |
| ***Piedmont*** | قەدپاڵی شاخەکان |
| ***Pler (pillar)*** | پایە، کۆڵەکە |
| ***Piestic water*** | ئاوی پیزتیك: بەهەمان مانای ئاوی ژێر زەوی پەنگ خواردووی پەستاو دێت. |
| ***Piezocrystallization*** | بوون بە کریستاڵ لەژێر پەستاندا |
| ***Pigment*** | بۆیە |
| ***Pike*** | ستوون |
| ***Pile*** | کۆمەڵ |
| ***Pillow*** | سەرین |
| ***Pillow lava*** | لاڤای سەرینی: لاڤای شێوە سەرینی خڕ کە لە ئەنجامی رەق بوونی لاڤاوە لە ژێر ئاودا دروست دەبێت. |
| ***Pillow structure*** | پێکهاتووی سەرینی |
| ***Pinacoid*** | پیناکۆید: شێوەیەکی کراوەی کریستاڵەکانە کە لە دوو رووی تەریب پێك دێن. |
| ***Pinching*** | تەسك بوون |
| ***Pinpoint porosity*** | کونیلەی ورد |
| ***Pipe*** | لوولە، بۆری |
| ***Pipe clay*** | قوڕی بۆری: تێکەڵەیەکە لەهەموو جۆرە گڵەکان لەگەڵ کارای یاریدەدەر، بۆ دروستکردنی جۆرەکانی بۆری. |
| ***Pipette*** | مژەر |
| ***Pipette method*** | رێگای مژین: ڕێگەیەکە بۆ شیکردنەوە و دیاریکردنی قەبارەی تەنۆکە زۆر بچوکەکان لە نیشتووە وردەکاندا. |
| ***Pisolite*** | بەردی پسولایت: ئەو بەردەیە کە پێکهاتووە لە تەنۆلکەی خڕ کە تیرەکەیان لە نێوان 1 ملم تا 10 ملم دەبێت. |
| ***Pit*** | چاڵ، کان |
| ***Pitch(rake)*** | پلەلاری یان لێژی: لە چینە چەماوەکاندا ئەو گۆشەیەیە کە دەکەوێتە نێوان ئاسۆو تەوەرەی نوشتاوە کەوە لە روویەکی تەوەرەییدا دەپێورێت. |
| ***Pitchstone*** | بەردی قیر |

Pivo/Plat

| | |
|---|---|
| *Pivot* | ناوەراسته پنت : كه دەبێته هۆی گۆڕان یان وەرچەرخانی بارێك. |
| *Placer deposits* | وردە نیشتوو: ئەو نیشتووه رووبارییانەیه كه بڕێكی باش له خاوه بەنرخەكانی تیادایه وەك ئاڵتون و پلاتینیۆم و ئەڵماس. بۆ ئەوەی خاو بەم جۆره بمێنێتەوه پێویسته زۆر رەق بێت و بەرگری له داخوران بكات بەهۆی ئاوەوه و هەروەها قورس بێت. لەهەندێ شوێنی رووبارەكاندا كۆدەبنەوەو دەتوانرێت جیا بكرێنەوه. |
| *Plagioclase* | بلاجیۆكلیز: كۆمەڵێك خاوه كه له كەڤرە ئاگریەكاندا بەشداره، و پێكهاتووه له زنجیرەیەك پێكهاتنی كیمیایی له سلیكاتی كالسیۆم، بەگشتی (Na, Ca) Al (Si, Al) $Si_2O_8$. خاوەكانی ئەم كۆمەڵەیه بریتییه له ئەلبایت، ئۆلیگۆكلیز، ئەندسین، لابرۆدۆرایت، بایتۆنایت و ئەنۆرثایت. كۆمەڵێكی زۆر گرنگن و دادەنرێن به یەكێك له خاوەكانی كەڤر دروستكەر. |
| *Plain* | دەشت |
| *Plane* | تەخت ، رووتەخت |
| *Plane of symmetry* | رووتەختی هاوتایی |
| *Planet* | هەسارەی گەڕۆك |
| *Planetesimals* | هەسارۆكەكان |
| *Planktonic* | سەرئاو كەوتوو، سەراوەر |
| *Planktones* | سەرئاو كەوتووەكان: بەو بوونەوەرانه (رووەكی یان گیانەوەری) دەوترێت كه سەرئاو دەكەون. |
| *Plaster* | گەچ |
| *Plasterstone* | بەردە گەچ (بڕوانه gypsum) |
| *Plasticity* | پلاستیكی: سیفەتێكی مادەیه كه رێ به شێواندنی هەمیشەیی مادە دەدات. |
| *Plastic limit* | سنووری پلاستیكی: رادەی تیابوونی ئاو له نیشتووەكاندا وەك خۆڵ له نێوان دۆخی پلاستیكی و نیمچه رەقدا. یەكێكه له سنوورەكانی ئەتەربێرگ. بەرامبەر وشەی Liquid limit دێت. |
| *Plateau* | بان: ناوچەیەكی بەرزه كه لوتكەكەی تەختەو لێوارەكانی لێژن. بەهەمان مانای Table land دێت. |

| | |
|---|---|
| Plate tectonics | سینیە تکتۆنیەکان: ئەو زانستەیە کە لە پێکهاتن و نەخشەی تونێکلی زەوی دەکۆڵێتەوە. وا بڕوا دەکات کە زەوی لە چەند سینیەکی گەورە دروست بووە کە کیشوەرو ئۆقیانوسەکان دەگرێتەوە. ئەم سینیانە پان و ئەستوور و گەورەن هەر یەکێك لەم سینیانە لەسەر بەشی چڕی کەوڵی زەوی جێگیر بووەو وەك ئەوە وایە سەرئاو کەوتبێت. |
| Platform | سەکۆ : ئەوبەشەیە لە کیشوەر کە داپۆشراوە بە نیشتووی تەخت یان زۆر کەم چەماوە کە نیشتووە لەسەر چینە کۆنە رەقەکانی ژێرەوە. واتە بەشێکە لە جێگیرەکان. |
| Platy structure | پانە پێکهاتوو |
| Pleistocene | بلایستۆسین: یەکەم سەردەمی ماوەی چوارییە لە چاخی ژیانی نوێدا، هەروەها دەناسرێت بە سەردەمی سەهۆڵبەندان. |
| Pleochroic | رەنگ گۆڕ |
| Pleochroism | رەنگ گۆڕان: سیفاتێکی کریستاڵە تایبەخۆ جیاوازەکانە کە کاتێك تیشك پیایدا تێپەڕ دەبێت رەنگەکەی دەگۆڕێت بەهۆی جیاوازی مژینی بۆ تیشك بەگۆڕینی ئاراستەی بلووری. |
| Plicated strata | چینە چەماوەکان |
| Plication | چەمانەوە، خواربوونەوە |
| Pliocene | بلایۆسین: دوا سەردەمی ماوەی سیانی. |
| Plug volcanic | دەمەوانەی گڕکانی |
| Plunge | نوقم بوون: هەر چینە چەماوەیەك تەوەرەکەی ئاسۆی نەبێت، ئەوا پێی‌دەوترێت نوقوم بووە، بڕی نوقم بوون بریتییە لەو گۆشەیەی نێوان تەوەرەو هێڵێکی ئاسۆی کە لەناو هەمان رووتەختی ستوونی دا درێژ بووبێتەوە. |
| Plunging fold | نوشتاوەی نوقم بوو |
| Pluriaxial | فرە تەوەرە |
| Plutonic rock | کەڤری پلۆتۆنی: ئەو کەڤرانەی کە لە قووڵاییدا بەهۆی بوون بە کریستاڵی ماگماوە دروست دەبن. دەناسرێن بە بوونی تنراوێکی ناوەندی تا زبر بۆ دەنکۆڵەکانی، وەك کەڤری گرانایت و گابرۆ. |
| Pluviometer | باران پێو |
| Poikilitic texture | تنراوی پۆیکلیتی: بەو تنراوەی کەڤرە نیشتووەکان دەوترێت کە قەبارەی کریستاڵەکان جیاوازن و لە کریستاڵە گەورەکاندا کریستاڵی خاوی جیاوازی قەبارە بچوکیان تیادایە. |
| Pointed | تیژ |
| Poisonous | ژەهرین |

| | |
|---|---|
| ***Poisson's ratio*** | ڕێژەی پۆیزن: ڕێژەی نێوان پانە جێ فشار بۆ درێژە جێ فشار لە تەنێکدا کە بە درێژی فشاری لەسەر بێت لە سنووری لاستیکیدا. یەکێکە لە جێگرەکانی حاڵەتی لاستیکی. |
| ***Polar*** | جەمسەری |
| ***Polarization*** | جەمسەرگری: لە بینایيدا گۆڕینی تیشک بەجۆرێك کە لەرەلەرەکەی بەیەك ئاڕاستەدا بێت لەیەك ڕووتەختدا. تیشکی جەمسەر گیراو بەکاردێت لە لێکۆڵینەوەی بڕگەی تەنکی خاوەکان لە ژێر وردبیندا. |
| ***Polarized light*** | ڕووناکی جەمسەرگیراو |
| ***Polarizer*** | جەمسەرگر |
| ***Polarization plane*** | ڕووتەختی جەمسەر گری |
| ***Pole*** | جەمسەر |
| ***Polished*** | سافکراو |
| ***Pollen grains*** | هەڵاڵە |
| ***Pollutant*** | پیس |
| ***Polyaxon*** | فرە تەوەرە |
| ***Polychroic material*** | مادە هەمە ڕەنگەکان |
| ***Polygenetic*** | فرە بنەچە: سیفەتێکە دەلالەت لە فرە بنەچەیی یان فرە شوێنی یان فرەکاتی دەکات. |
| ***Polygon*** | چەند لا |
| ***Polyhedron*** | فرە ڕوو |
| ***Polymorphism*** | هەمە شێوەیی: سیفەتێکی ئەو مادانەیە کە هەمان پێکهاتنی کیمیاییان هەیە بەڵام لەسەر چەند ڕژێمێکی جیاواز دەبن بە کریستاڵ وەك خاوی ($CaCO_3$) کە لە کالسایت دا لەسەر ڕژێمی شەش لاو لە ئەرەگۆنایت دا لەسەر ڕژێمی لەبزینەیی دەبێت بە کریستاڵ. |
| ***Polythalamous*** | فرە ژوورەکان |
| ***Polyzoa (bryozoa)*** | چووزەوارییەکان، قەوزەکان (بڕوانە bryozoa). |
| ***Pond*** | چاڵاو |
| ***Porcelain*** | پۆرسیلین : جۆرێکە لە قوڕی سوتێنراو لە پلەی گەرمای بەرزدا (1300 –1350)م°کە چۆتە قۆناغی بوون بە شوشە . |
| ***Pore*** | کون |
| ***Porifera (spongs)*** | ئیسفنجییەکان: پۆلێکن لە گیاندارە بێ بڕبڕەکان کە پێکهاتنێکی ساکاری هەیە. گیانداری جێگیرن لە بنی دەریاکاندا و دڕکی کلسی یان سلیکیان هەیە. |

Poro/Prob

| | |
|---|---|
| *Porosimeter* | کونیلە پێو |
| *Porosity* | کونیلە: ڕێژەی سەدی قەبارەی بۆشاییەکانی ناو کەڤرێك یان خۆڵێکە بۆ قەبارەی گشتی کەڤرەکە یان خۆڵەکە. لە هەندێك تورِدا ئەم ڕێژەیە دەگاتە 50٪. مەرج نییە ئەو کەڤرەی کونیلەدار بێت توانای دەڵاندنی هەبێت. |
| *Porphyry* | پۆرفیری: سیفەتێکی کەڤرە ئاگرینەکانە کە کریستاڵی گەورە لەناو ناوەندێکی کریستاڵی بچوکدا هەیە. |
| *Position* | شوێن |
| *Positive* | موجەب ، پۆزەتیڤ |
| *Posterior* | پاش |
| *Post glacial* | پاش سەهۆڵ بەندان |
| *Posthumous fold* | نوشتاوەی پاشکەوتوو |
| *Potamogenic deposits* | نیشتووی ڕووباری |
| *Potamology* | زانستی ڕووبارەکان |
| *Potential* | ئەرك |
| *Potential energy* | وزەی شاراوە |
| *Pothole* | هەڵکۆڵین: چاڵێکە لەناو کەڤردا لەبنی هاتنە خوارەوەی تافگەدا دروست دەبێت وە یەکێکە لە کردارەکانی داخوران بەهۆی ئاوەوە. |
| *Power* | توانا، هێز |
| *Pre-Cambrian* | پێش کامبری: زاراوەیەکی گشتییە بۆکاتی جیۆلۆجی بە پێش ماوەی کامبری دەوترێت. |
| *Precession* | وردی |
| *Precipitation* | نیشاندن : کرداری نیشتنی‌خاوەکان لە گیراوەکانیانەوە بەهۆی کرداری بەهەڵم بوون وەك لە دروست بوونی خوێکاندا. |
| *Pre glacial* | پێش سەهۆڵ بەندان |
| *Pressed peat* | خەڵوزی پەستێنراو |
| *Pressure* | پەستان: هێز بۆ یەکەیەکی ڕووبەری دیاریکراو، واتە فشار. |
| *Primary( Primitive)* | سەرەتایی |
| *Principal* | سەرەکی |
| *Print* | شوێنەوار، چاپ |
| *Prior* | پێشوو |
| *Priority* | پێشەکی |
| *Prism* | پوازە |
| *Probability* | شیان، ئەگەر |

| | |
|---|---|
| ***Probes*** | هەستەوەرەکان |
| ***Procedure*** | جێبەجێکردن |
| ***Process*** | کردار |
| ***Product*** | بەرهەم |
| ***Profile*** | لا بڕگە |
| ***Progradation*** | خشانی لێواری: کەڵەکەبوونی نیشتووەکان بە ئاراستەی دەریا، وەك لە رووباردا یان لە خاك لماودا روودەدات. |
| ***Program*** | بەرنامە |
| ***Projection*** | جێکەوتە، کەرتگا |
| ***Prolate*** | درێژبووەوە |
| ***Proloculom*** | ژووری یەکەمین: یەکەمین ژوور کەلە پەیکەری فورامنیفێرادا دروست دەبێت. |
| ***Promonotry*** | سەر: بەرز بوونەوەو دەرکەوتنی بەشێك لە وشکانی لەناو دەریادا. |
| ***Propagation*** | بڵاوبوونەوە، گواستنەوە |
| ***Property*** | تایبەتی ، رەوشت |
| ***Prospection*** | پشکنین: کرداری گەڕان بەدووای خاوە بەنرخەکان لە زەویدا. |
| ***Proterozoic*** | چاخی ژیانی هەرە دێرین: دووەم چاخی پێش ماوەی کامبرییە لە کاتی جیۆلۆجیدا. |
| ***Protheca*** | بەرگی سەرەتایی |
| ***Protista*** | یەك خانەیی |
| ***Protobranchia*** | کەوانە ریشووی سەرەتایی |
| ***Protoconch*** | لەپکەی سەرەتایی |
| ***Protoplanet*** | هەسارۆکەی سەرەتایی |
| ***Protopore*** | کونی سەرەتایی |
| ***Protozoa*** | گیانەوەرە سەرەتاییەکان ، سەرەتاکان : گیانەوەری بێبڕبڕەی یەك خانەیین، هەندێکیان پەیکەرێکی رەقیان هەیە. قەبارەیان لە نێوان 0.1 ملم تا 8 سم دەبێت. وەك فورامنیفێرا و رادیولاریا. |
| ***Protractor*** | گۆشە پێو |
| ***Pseudo*** | درۆینە |
| ***Pseudomorph*** | درۆینە شێوە: بەو خاوە دەوترێت کە لە شێوەی کریستاڵی خاوێکی تردا هەبێت، واتە شوێنی خاوێکی تری گرتبێتەوە. وەك کوارتز لە شوێنی فلۆرایت دا. |
| ***Pseudopodia*** | گەندە پێکان |
| ***Pterodactyl*** | خشۆکە باڵدارەکان |

Pter/Pyro

| | |
|---|---|
| **Pteropoda** | پێباڵییەکان: کۆمەڵێک گیانداری مەلەوانن، قاچیان گۆڕاوە بەشێوەی باڵ. |
| **Puddle** | گۆماو |
| **Pulmonta** | سیدارەکان |
| **Pulse** | لێدان |
| **Pumice** | سوکە بەرد: کەڤرێکی ئاگری رەنگ کراوەی سپی، شوشەی کون کونە هەمان پێکهاتنی کیمیایی رایولایتی هەیە. هێندە سوکە سەر ئاو دەکەوێت. |
| **Pumping** | هەڵهێنجان |
| **Punctate** | کونکراو |
| **Punctate shell** | لەپکەی کونکراو: ئەو لەپکەیەیە کە کونی وردی تیایە وەك لەپکەی پێبازووییەکان. |
| **Pure** | خاوێن |
| **Purity** | خاوێنی |
| **Putrid** | بۆنکردوو |
| **Pyramid** | قووچەك |
| **Pyramidal** | شەقبوونی قوچەکی |
| **Pyrite** | پایرایت، زێڕی درۆینە: یەکێکە لە کانزا گۆگردیکە بڵاوەکان. پێکهاتنی کیمیایی $FeS_2$ و لەسەر رژێمی شەش پاڵوو دەبێت بە کریستاڵ رەنگێکی زەردی مسی هەیە، بریسکەیەکی کانزایی هەیەو شەقبوونی نییە. لە ئاڵتون نەرمتر و سوکترە. |
| **Pyroclastic** | وردبووی گڕکانی: بەو کەڤرانە دەوترێت کە پێکهاتوون لە وردە کەڤری لە بنچینەدا گڕکانی. |
| **Pyrogenous** | ئاگری |
| **Pyrosphere** | بەرگی ئاگری |
| **Pyroxenes** | پایرۆکسین: کۆمەڵێك خاوی رەشن، دادەنرێن بە خاوە سلیکاتییە کەڤر دروست کەرەکان.<br>پێکهاتنی کیمیاییان: $A\ B\ Si_2\ O_6$<br>کاتێك کە $A$=Ca, Na, Mg, $Fe^{+2}$<br>$B$=Mg, $Fe^{+2}$, Al<br>هەندێك جار سیلیکۆن جێی ئەلەمنیۆم دەگرێتەوە رێژەی سلیکا بۆ ئۆکسجین 3:1 یە. لە پێکهاتنی کەڤرە ئاگرییەکاندا هەیە. لە خاوەکانی دایۆپساید و هایپەرستین و ئینستاتایت و جادایت و ئۆگایت و ...هتد. |

# -Qq-

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| *Quadratic mean* | ناوەندی دووجایی |
| *Quadrille* | تۆڕی |
| *Quag* | زەلکاو |
| *Quake* | لەرە |
| *Quake sensitivity* | هەستەوەری بوومەلەرزەیی |
| *Qualitative* | جۆری |
| *Quality* | چاکی، باشی |
| *Quality control* | چاودێری جۆری |
| *Quantitative* | بڕی |
| *Quarry* | کان : کانگای سەر رووی زەوی. |
| *Quartile* | چوار یەك |
| *Quartz* | کوارتز: کریستاڵی سلیکا و یەکێکە لە خاوە کەڤر دروست کەرەکان. پێکهاتنی کیمیایی $SiO_2$ و لەسەر رژێمی شەش لا دەبێت بە کریستاڵ. بێڕەنگ یان رەنگدارە (زەرد، قاوەی، سوور، سەوز، شین یان رەش بەهۆی خەوشەوە). زۆر بڵاوە لەناو گرانایت دا. بریسکەیەکی شوشەی هەیەو شەقبوونی نییە و رەقێتی‌یەکەی (7) بەپێی پێوەری مۆهس و لەشکاندن دا محاری دەبێت. بەگشتی بەکاردێت بۆ هەر شێوەیەك کە هەمان پێکهاتنی هەبێت بوو بێت بە کریستاڵ یان نا وەك چالسیدۆنی و ئۆپاڵ و ئەگەیت. |
| *Quartzite* | کوارتزایت: کەڤرێکی‌گۆڕاوە کە بەشێوەیەکی سەرەکی لە کوارتز پێکهاتووەو زۆر رەق و بەهێزە. لە ئەنجامی گۆڕانی بەردی لمیەوە دروست دەبێت . |
| *Quaternary period* | ماوەی چوارەم: ماوەی دووەمی چاخی نوێیە، لەدوای ماوەی سیانییەوە دێت و ئەم دوو سێ ملیون ساڵەی دووایش دەگرێتەوە. لە دوو سەردەم پێکدێت بلایستۆسین و هۆلۆسین. |
| *Quest* | پشکنین |
| *Quiescent* | هێمن، مەنگ |
| *Quiescent volcano* | گڕکانی هێمن |
| *Quinquloculina* | پێنج ژوورییەکان:جۆرێکە لە فۆرامنیفێرا کە دەناسرێت بە بوونی پێنج ژووری دیار لە پەیکەرەکەیدا. |
| *Quintiles* | پێنج یەك |

# -Rr-

| ئینگلیزی | کوردی |
| --- | --- |
| *Radial* | تیشکی |
| *Radial fault* | لێکترازاوی شێوە تیشك |
| *Radiation* | تیشکدانەوە |
| *Radioactivity* | چالاکی تیشکدانەوە: هەڵوەشانی لەخۆوەی گەردیلەکانی<br>هاوتایەکی دیاریکراو بۆ هاوتاکانی تری کە لەوانەیە جێگیر بێت<br>یان پاش چەند هەڵوەشاندنێکی تر جێگیر دەبێت. تیشکدانەوە<br>سێ جۆر دەبێت دەنکۆڵەکانی ئەلفاو بێتا و تیشکی گاما<br>دەدرێتەوەو گەرمای دروست دەبێت. |
| *Radio element* | توخمی تیشکدەر |
| *Radiolaria* | رادیولاریا، تیشکدارەکان: بەشێکە لە گیانەوەرە سەرەتاییە یەك<br>خانەییەکان کە بەگشتی پەیکەرەکەیان لە ماددەی سلیکا دروست<br>دەکەن و هەندێك جار لە گۆگردیداتی سترۆنتیۆم. دەناسرێن بە<br>پەیکەرە رازاوەو نەخش جوانەکانی و دڕکی زۆر کە بەشێوەی<br>تیشك بڵاو بۆتەوە. |
| *Radiolarite* | رادیۆلارایت: بەو کەڤرە دەوترێت کە لە پەیکەری رادیۆلاریا<br>دروست بووە. |
| *Ramp* | لاپاڵ |
| *Random* | کوێرانە |
| *Random distribution* | دابەشکردنی کوێرانە |
| *Range* | بوار |
| *Rate* | تێکڕا |
| *Ratio* | ڕێژە |
| *Raw material* | مادەی خاو |
| *Reaction* | کارلێك |
| *Reagent* | دۆزەر |
| *Recent* | تازە: دوایین کاتی جیۆلۆجیە کە لە دوای سەردەمی<br>بلایستۆسین و بەهەمان مانای هۆلۆسین دێت. |
| *Recess* | گەڕانەوە |
| *Reconnaissance* | دۆزینەوە |
| *Record* | تۆمار |
| *Recording unit* | یەکەی تۆمارکردن |

*Recr/Regi*

***Recrystallization***

دووباره بوون به کریستال:
-دروست بوونی کریستاڵی نوێ له دەنكۆڵه خاوه کریستاڵەکان دا لـه دۆخێکـی رەق دا لـەژێر کردارەکـانی گۆڕانـدا. دەنكۆڵـه تازەکان لەوانەیـه هـەمان پێکهاتنی کیمیایی و خـاوی ئەوانـەی پێشوویان هەبێت یان جیاواز دەبن.
-یـان شـیبوونەوەی لەسـەرخۆی مـاده بنچینەیەکەی پەیکـەری بووبەردەکان و جێگرتنەوەیان به مادەیەکی کریستاڵی تازه.

***Recumbent***

بەلادا کەوتوو: سیفەتێکی ئەو چینه چەمانەوانەیه که رووتەختی تەوەرەییان بەشێوەیەکی ئاسۆییه یان نیمچه ئاسۆییه.

***Recycle***

دووبارەبوونەوەی خول

***Reduction***

کەمکردنەوه

***Reef***

مۆڵگه:
-دەماری کوارتزی که ئاڵتونی تیادا بێت.
-بەرزاییـەکی کەڤرییـه، کـه بەشـی سـەرەوەی لەسـەروو رووی دەریاوەیه لەبەرئەوه لـەکاتی هەڵکشانی ئاودا دادەپۆشرێت به ئاو.
-کۆبوونەوەیەکی مادەی پەیکەری ئەندامی ئەو کۆبوونەوانەیه که لـه شـوێنی خۆیانـدا گەشـه دەکـەن. لـه کـاتی ئێسـتادا مۆڵگەشیلانییەکان بڵاوترین جۆرن کـه لـه کاربۆنـاتی کالسیۆم دروست بووه. شێوەی جیاوازی هەیه وەك خڕو لێواری و ...هتد.

***Reel***

خلۆکه

***Reflection***

پەرچکردنەوه ، گەڕاندنەوه: گەڕانەوەی شەپۆلێکی کەوتووه سەر رووی یەك بۆ هەمان ناوەندی که لێوەی هاتووه.

***Refolding***

چینه چەماوەی دووباره بووەوه

***Refraction***

شکانەوه: لادانی تیشکی رووناکی یان هەر شەپۆلێکی وزه، وەك شەپۆلەکانی بوومەلەرزەیی، بەهۆی رۆیشتنی لەناوەندێکەوه بۆ یـەکێکی تـر کـه چڕ یـان جیاواز بێت کـه ئەمـەش دەبێتـه هـۆی گۆڕانی خێرایی ئەو شەپۆله.

***Refractive index***

هاوکۆلکەی شکاندنەوه: له زانستی بیانایی کریستاڵەکاندا، ئەو ژمارەیه که دەکاته ڕێژەی نێوان خێرایی رووناکی لـه هـەوادا بۆ خێرایی رووناکی لەناو کریستاڵەکەدا. بەهەمان مانای index of refraction دێت.

***Refractometer***

شکانەوه پێو

***Regeneration***

تازه بوونەوه

***Region***

هەرێم

Regr/Resi

| | |
|---|---|
| ***Regression*** | پاشەکشە : کشانەوەیان گەڕانەوەی دەریا لە ناوچە وشکانی‌یەکان بەهۆی دابەزینی ئاستی رووی دەریاوە یان بەرزبوونەوەی ناوچە وشکانی‌یەکان. دژەکەی وشەی transgression دێت. |
| ***Regular*** | رێك و پێك |
| ***Rejuvenation*** | تازەبوونەوە: تازەبوونەوەی توانای رووبار بۆ چالاکی داماڵین و داخوران بەهۆی بەرزبوونەوەی ناوچەکەوە لەسەر ئاستی دەریاوە. یان تازەبوونەوەو سەرلەنوێ بوونەوەی هەرکردارێکی جیۆلۆجی. |
| ***Relative frequency*** | دووبارەبوونەوەی رێژەیی |
| ***Relief*** | بەرزو نزمی |
| ***Relief map*** | نەخشەی بەرزو نزمی |
| ***Reluctance*** | بەرگری موگناتیسی |
| ***Remains*** | پاشماوەکان |
| ***Remote sensing*** | هەستکردن لە دوورەوە: زانیاری دەستکەوتن لە هەندێ سیفاتی شتێك یان دیاردەیەك بەبێ بەرکەوتن لەگەڵ ئەو شتەدا. ئەم تەکنیکەش بەهۆی کامێراو لێزەرو بەکارهێنانی تیشکی سەروو بنەوشەیی و ژێر سوورەوەو رژێمی رادار و....هتد دەبێت. |
| ***Reniform aggregates*** | کۆبووەوە شێوە گورچیلەییەکان |
| ***Replacement*** | جێگرتنەوە: کرداری جێگرتنەوەو نیشتنی‌خاوێکی نوێ جیاواز لە پێکهاتنی کیمیاییدا کە لەوانەیە هەمان شێوەیان قاڵبی‌خاوە کۆنەکە بگرێتەوە. لە جۆرەکانی جێگرتنەوە. جێگرتنەوەی ئایۆنی یان کریستاڵی یان جێگرتنەوەی پەیکەری بووبەردەکان لە لایەن خاوی ترەوە یان جێگرتنەوەی بەردە کلس لەلایەن چێرتەوە. |
| ***Reptile*** | خشۆکەکان |
| ***Reserve*** | دەیگرێ |
| ***Reservoir*** | کۆگە، تەنکی، ئەستێر:<br>1-لە نەوتدا، کۆبوونەوەیەکی ژێر زەوی نەوت یان گازی سروشتییە لە ژێر بارودۆخی قەتیس ماودا.<br>2-لە ئاو دا، کۆگایەکی سروشتی یان دەستکردە بۆ کۆبوونەوەی ئاو وەك دەریاچە... هتد. |
| ***Residual*** | پاشماوە، بەجێماو |

Resi/Rewo

| | |
|---|---|
| ***Residual deposits*** | نیشتووی بەجێماو: –بەو مادە بەجێماوانە دەوترێت کە لەدوای کەشاندنەوە لە شوێنی خۆیان دەمێننەوە. –نیشتووی خامێك لە ناو قوڕدا وەك ئاسن و قوڕقوشم و مەنگەنیز یان زینك کە بەهۆی کرداری بە ئۆکسیدبوونەوە دروست بووە. |
| ***Resin*** | شەبینە، بنێشت ، زەمق : مادەیەکی زەردباو یان قاوەییە کە بریسکەیەکی تایبەتی هەیە کە بنێشتییە، ئەتوێتەوەو گڕدەگرێت، لەناو ئیسەر یان توێنەرەوە ئەندامییەکان دا ئەتوێتەوە بەڵام لە ئاودا ناتوێتەوە. مادەیەکی نا کریستاڵییەو لە رووەکەوە دەست دەکەوێت. |
| ***Resistance*** | بەرگری |
| ***Resistivity*** | جۆرە بەرگری |
| ***Resolution*** | شیبوونەوە |
| ***Resorption*** | مژین |
| ***Resultant*** | دەرئەنجام، ئەنجام |
| ***Retardation*** | دواخستن، کورتکردنەوە |
| ***Retention*** | هەڵگرتن، گلدانەوە |
| ***Reticulate*** | تۆڕی، تێکئالاو |
| ***Retrograde*** | پاشە کشێ: کشانەوەی وشکانی بەهۆی داخوران بەهۆی شەپۆلە دەریاییەکانەوە. |
| ***Reverse*** | هەڵگەڕاوە |
| ***Reversed fault*** | لێکترازاوی هەڵگەڕاوە: ئەولێکترازاوەیە کە لارییەکەی 45° یان کەمترە و دیواری هەڵواسراو بەرەو سەرەوە دەجوڵێت بە رێژەی پێدیوارەوە. لادانی ئاسۆی زیاترە لە لادانی ستوونی بەهەمان مانای **Thrust fault** دێت. |
| ***Reversed fold*** | چینە چەماوەی هەڵگەڕاوە: ئەو چینە چەماوەیەیە کە تەوەرەکەی بەشێوەی ستوونی نییە بەهەمان مانای **overturned fold** دێت. |
| ***Reversible*** | هەڵدەگێڕێتەوە |
| ***Revolve*** | ئەخولێتەوە |
| ***Reworked*** | دووبارە نیشتوو: بەو نیشتووە یان بەردە یان پارچە کەڤر یان هەر ماددەیەکی جیۆلۆجی دەڵێن کە جولابێت لە شوێنی خۆی بەهۆی هۆکارێکی سروشتییەوە و لەگەڵ پێکهاتوویەکی تازەتر نیشتوو بێتەوە. |

Rhom/Rive

| | |
|---|---|
| ***Rhombic system*** | سیستەمی لاتەریبی یان لەبزینەیی (بڕوانە Orthorhombic). |
| ***Rhombohedral*** | لەبزینەییە ڕووەکان |
| ***Rhombohedral cleavage*** | شەقبردنی لەبزینەیی |
| ***Rhyolite*** | رایۆلایت: کەڤرێکی ئاگرینی گڕکانییە بەگشتی تنراوێکی پۆرفیری هەیە کە کریستاڵەکانی کوارتز و فلدسپار (بە تایبەتی ئۆرسۆکلین) گەورەن و لە ناو زەمینەیەکی شوشەی یان کریستاڵی زۆر وردا. بەرامبەرەکەی لە کەڤرە ئاگرینە پلۆتۆنییەکاندا گرانایتە. |
| ***Rhythmic sedimentation*** | نیشتنی هاوڕێکی: دووبارە بوونەوەیەکی ڕێك و پێکی جێگیرە بە ئەستووورای چەند چینێکی بەدوای یەکدا. لەوانەیە دوو جۆر کەڤر دووبارە ببێتەوە (وەك قوڕ و لم) بە ئەستووورای ئەو لەدواییەکە. |
| ***Ridge*** | بەرزایی |
| ***Rift valley (Graben)*** | دابەزیوو، داتەپیو: دۆڵێکی درێژە کە ئەم لاو ئەو لاکەی لێکترازاو بێت، بەهۆی داچوونێکی تکتۆنیەوە دروست دەبێت. بەهەمان مانای گرابن یان تەفرۆ جیۆسنکلاین دێت. |
| ***Rigid*** | ڕەق، توند |
| ***Rigidity*** | ڕەقی، توندی: یەکێك لە سیفاتەکانی مادە، بەرگری کردن لەو فشارەی کە دەخرێتە سەر مادە کە دەیەوێت بیشێوێنێت. بۆ نموونە شلەمەنی توندیان یەکسانە بە سفر. |
| ***Rill*** | کەندەك، کەندڕ |
| ***Rim*** | لێوار |
| ***Ring*** | ئەڵقە |
| ***Ripple mark*** | شەپۆلە نیشانە: ڕوویەکی نەخش کراوە بریتییە لە بەرزایی و نزمایی لەدوای یەك و تەریب بەیەکتر، لەسەر زەوی بەهۆی باوەو لە ناو ئاودا بەهۆی تەوژمەکانی ئاوەوە دروست دەبێت لە هەندێ جاردا بەکاردەهێنرێت بۆ دەست نیشانکردنی ئاراستەی با یان تەوژم لە کۆندا. |
| ***Rise*** | بانی دەریایی |
| ***River*** | ڕووبار: زاراوەیەکی گشتییە بەکاردێت بۆ ئەو ئاوە پاکەی کە بە سروشتی لە ناو جۆگەیەکدا ڕووەو دەریا یان دەریاچە یان ڕووبارێکی تر دەڕوات. |
| ***River capture*** | دیلی ی ڕووبار |
| ***River meandering*** | پێچاوپێچی ڕووباری |

| | |
|---|---|
| **River terraces** | نیشتووی پێپلیکانە ڕووباریەکان |
| **Rivute** | جۆگە، چەم |
| **Rock** | کەڤر: لە زەوی ناسیدا هەر مادەیەکی سروشتی ڕەقبوو یان ڕەق نەبوو (بەڵام خۆڵ نەبێت) پێکهاتبێت لەخاوێك یان زیاتر و خاوەن پێکهاتنێکی کیمیایی وخاوی تا ڕادەیەك جێگیر بێت. لە زانستی ئەندازیاری شارستانیدا کەڤر بریتییە لە هەر مادەیەکی ڕەقی بەهێز کە توانای پەستان لێکردنی هەبێت و لە کۆتایی دا ئەگەر پێویست بوو بشکێت ئەم پێناسەیە لەگەڵ مانا گشتییەکەیدا دەگونجێت. |
| **Rocky** | کەڤری |
| **Rock mechanics** | میکانیکی کەڤر: بریتییە لە لێکۆڵینەوەی سیفاتە میکانیکیەکانی کەڤر بە تایبەت ئەو سیفاتانەی کە لە ئەندازیاری شارستانیدا بەکاردێت. وەك دیاریکردنی سیفاتە فیزیاییەکان (بەرگری شکاندن و هاوکۆلکەی لاستیکی و گۆشەی ناوەوەی لێخشاندن و کونیلەی دەلاندن و چڕی و ....هتد). |
| **Rock salt** | بەردە خوێ: بریتییە لە هالایتی کریستاڵ گەورە ، بە شێوەی تۆپەڵ یان ڕیشاڵی یان دەنکۆڵەیی هەیە. هەندێك جار ڕەنگ دەگرێت بۆ هۆی بوونی ناسنەوە تیایدا. |
| **Rossete** | گوڵی، گوڵ شێوە |
| **Rossete texture** | تنراوی گوڵ گوڵی |
| **Rostrum** | دەنووك |
| **Rotary drilling** | هەڵکەندن بە سوڕانەوە |
| **Rotation** | سووڕانەوە یان خولانەوە |
| **Roundness** | لووسی: بریتییە لە پلەی داخورانی پارچەی وردبووی کەڤر کە دیاری دەکرێت بە هۆی تیژی لێوارەکانی و گۆشەکانییەوە. ئەم سیفەتە سەربەخۆیە لە سیفەتی شێوەی ئەو پارچە وردبووانە. ماتماتیکیانە بریتییە لە ڕێژەی نێوان تێکڕای نیوەتیرەی ئەو چەمارانەی کە لێوارەکان وگۆشەکان دروستی دەکەن بۆ نیوە تیرەی گەورەترین چەماوەی ئەو بازنەیەی دەکەوێتە ناو پارچەکەوە. |
| **Rudist** | ڕودست: بەهەر یەکێك لەو نەرمۆڵە دوو دەروازانە (لەپکانە) دەوترێت کە دەگەڕێتەوە بۆ سەروو خێزانی هیپۆرتاشیا، دەناسرێت بە بوونی دوو دەروازەی جیاواز. بەگشتی لەگەڵ مۆڵگە شیلانییەکاندا دەبینرێت. لە جوراسیکی درەنگەوە تا کریتاسی درەنگ هەبووە. |

*Rugo/Ruti*

***Rugose coral***

شیلانە چوارییەکان: بەهەر یەکێك لە هەناو ریخۆڵەییەکان دەوترێت کە دەگەڕێتەوە بۆ هۆزی رۆگۆزا. دەناسرێت بە بوونی پەیکەری کلسی شێوە لوولەکی یان قووچەکی خوار یان راست لە ماوەی ئۆردۆفیشی‌یە دەرکەوتوو تا ماوەی پێرمی بەردەوام بووە، بە هەمان مانای Tetra coral دێت.

***Rutile***

روتایل :خاوێکی قاوەیی سوورباوە (هەندێ جار زەردباو یان سوورێکی تێر یان رەش دەبێت) لەسەر رژێمی چوار لا دەبێت بە کریستاڵ. پێکهاتنی کیمیایی بریتییە لە $TiO_2$ . لەناو هەندێ لە کەڤرە ترشە ئاگرینەکاندا هەیە هەروەها لەناو کەڤرە گۆڕاوەکان و لە هەندێ نیشتووی کەنار دەریاکاندا.

# -Ss-

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| Sabuline | لمی |
| Sabkha | خوێڵین (سەبخە): زاراوەیەکی عەرەبییە بەو ناوچە تەختە پانە بە خوێ داپۆشراوە دەوترێت کە دەکەوێتە کەنار دەریاوە. ناوچە نموونەییەکەی دەکەوێتە هەرێمی ئەبوزەبییەوە. دوو جۆر سەبخە هەیە یەکێکیان کەناری ئەوی تریان لەسەر کیشوەرەکان دروست دەبێت. |
| Saccaroid texture | ڕەشتەی شەکری: ئەو ڕەشتەیەیە کە وەك شەکر دەردەکەوێت، کە دەناسرێت بە بوونی کریستاڵی قەبارە بچوك و مامناوەندی کە تەواو بەیەکەوە نووساون. وەك لە کەڤرەکانی مەڕمەڕو کوارتزایتدا. |
| Saddle | زین |
| Sagging | دابەزین |
| Sagittarius | لەپکەیی |
| Sag pond | چاڵاوە دابەزیو: ئەو چاڵەیە، کە پڕبۆتەوە بە ئاو، کە لە ئەنجامی دابەزین بەهۆی لێکترازاوێکەوە دروستبووە. |
| Salient | دەرکەوتوو |
| Saliferous | خوێیی |
| Salina | خو ێڵین |
| Salinometer | سوێرپێو |
| Salinity | سوێری: بڕی ئەو خوێیە تواوەوەی ناو ئاوی دەریا. بە پێوانەی بەشێك لەهەزار بەش دەپێورێت. |
| Saltation | بازدان:<br>1-لەزانستی گەشەسەندندا: بەو گەشەکردنە کوتوپڕەی بوونەوەر دەڵێن کە یەکسەر بوونەوەرێکی نوێ دروست ببێت بەبێ تێپەڕ بوون بە قۆناغی ناوەندیدا.<br>2-لەزانستی نیشتووەکاندا: بەکاردێت بۆ وەسفکردنی جوڵەی ئەو پارچە کەڤرانەی کە بەهۆی ئاو یان باوە دەگوێزرێنەوە، بەڵام لەبەر قورسیان ناتوانن بە هەڵواسراوی لەناو ئاوەکەدا بمێننەوە، بۆیە بەڕێگەی بازدان جوڵە دەکەن. |

Salt/Sche

| | |
|---|---|
| **Salt dome** | گومەزی خوێی: پێکهاتوویەکی گومەزی شێوەیە تیرەکەی 1کم تا 2کم دەبێت. زۆربەیان بەشێوەی ستوونی و هەندێکیان بەشێوەی هەڵواسراون. نیشتووی لاکانی تووشی لێکدابڕان دەبن، کە دەبێتە کۆگایەکی باش بۆ کۆبوونەوەی گاز و نەوت. |
| **Salt water wedge** | پوازی خوێ (سوێراوی پەنگ خواردوو) |
| **Sampling** | نموونە وەرگرتن |
| **Sand** | لم: لە نیشتووەکاندا بەو پارچە کەڤرانە یان وردبووانە دەوترێت کە تیرەکەیان لە نێوان 1/16ملم تا 2ملم بێت. |
| **Sand bar** | بەربەستی لمی |
| **Sand dune** | تەپۆڵکەی لمی |
| **Sandstone** | بەردی لمی: کەڤرێکی وردبووی دەنکۆڵە مامناوەندییە کە پێکهاتووە لە دەنکۆڵەی قەبارە لمی لووس یان گۆشەدار کە لەناو زەمینەیەکی دەنکۆڵە بچوکدا بڵاوبۆتەوە کە بەهۆی سمنتی کلسی یان سلیکی یان ئاسنی زیاتر پێکەوە بەستراوەو توندو رەقێتی وەرگرتووە. لە رەنگدا جیاوازە سوورو زەردو قاوەی و سەوز و سپی و لەوانەیە جۆرەها پێکهاتووی نیشتووی تیادا بەدەربکەوێت. |
| **Sapphire** | یاقوتی شین: خاوی کۆرەندەمی ($Al_2O_3$) رەنگ شینی رووناك. |
| **Satinspar** | ریشاڵی: زاراوەیەکە بەکاردێت بۆ وەسفکردنی ئەو خاوانەی کە بەشێوەی ریشاڵی و سپی و رووناك دەردەکەون وەك کالسایت و جیبسۆم. |
| **Saturation** | تێر بوون |
| **Saturn** | کەیوان: یەکێکە لە هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆر. |
| **Scale** | پێوەر |
| **Scale up** | گەورەکردن |
| **Scaling** | توێژاڵ دروست بوون: جۆرێکە لە بوون بە توێژاڵ لە ئەنجامدا کەڤرەکە پەرە پەرە یان بە شێوەی پولەکەی لێ دێت. |
| **Scaly structure** | پێکهاتووی پوولەکەیی |
| **Scaphopoda** | پێبەلەمییەکان |
| **Scar** | چاڵ: لە بووبەردزانیدا بە شوێنی ماسولکەکان دەوترێت. |
| **Scarp** | تەلان، رادان: بەهەمان مانای escarpment دێت. |
| **Scentless** | بێبۆن |
| **Schematic** | دەستنووسی |

Schi/Sedi

**Schist** — شیست: کەڤرێکی گۆڕاوی ناوچەییە دەناسرێت بە بوونی ریزبوونێکی تەریبی خاوە پێکهێنەرەکانی کەڤرەکە. بەهۆی گۆڕانی دینامیکییەوە دروست دەبێت بەناوی خاوە سەرەکیەکەیەوە ناودەبرێت وەك شیستی مایکای..

**Schistosity** — شستۆستی: توێ توێ بون لە کەڤری شیستدا یان هەر کەڤرێکی کریستاڵ گەورە بەهۆی ریزبونی تەریبی خاوەکانی ئەو کەڤرەوە.

**Scissor fault** — لێکترازاوی مەقەستی: ئەو لێکترازاوەیە کە لێك جیابونەوە بەدرێژایی لێدەر زیاد دەکات لە کاتێکدا خاڵی بنەڕەت جیانەبۆتەوە و لادانی تیادا نییە.

**Scratch** — رووشان

**Scree** — کەڵکە بەرد: کۆبونەوەی پارچە پارچەی بەرد لە ئەنجامی کەشاندنی میکانیکیدا کەبەکسەر کەڤرەکاندا دێت، بەگشتی لە بنی لێژگەکاندا دروست دەبێت. بەهەمان مانای talus دێت.

**Sea** — دەریا، زەریا

**Sea level** — ئاستی دەریا

**Seam** — چین : لەخامەکاندا، بەو چینە خامانە دەوترێت کە خەڵوز یا خاوە کانزاییەکان دروستی دەکەن . لە چینزانیدا بەو چینە تەنکە دەوترێت کە دەکەوێتە نێوان دوو چینی لێك جیاواز لە پێکهاتندا.

**Secondary** — ناوەندی

**Sectile** — بڕاو

**Section** — بڕگە: لە زەوی ناسیدا بەو رووە دەرکەوتووە دەوترێت کە بەشێوەیەکی سروشتی (وەك کەنار دەریاکان یان جۆگەی رووبارەکان) یان دەست کرد (وەك کانگاکان و بڕینی رێگاکان) لە توێکلی زەویدا دروست بووەو بە ستوونی یان لار دەبێت.
لە چینزانیدا: بەماناکانی بڕگەی ستوونی و بڕگەی جیۆلۆجی و بڕگەی نموونەی دەتوانرێت بەکاربهێنرێت.

**Sector** — بڕەر

**Sedentary** — جێگیر، نەبزۆك

**Sediment** — نیشتوو: مادەی وردبووی رەقە ئەندامی یان نا ئەندامییە بەهۆی کەشاندنی کەڤرەکانەوە دروست دەبێت و بەهۆی ئاو یان با یان سەهۆڵەوە دەگوێزرێتەوەو بەهۆی کردارە سروشتیەکانی وەك نیشتنی کیمیایی یان فیزیاییەوە دەنیشێن بۆنموونە وەك لم و چەو و قوڕ و لوس.

| | |
|---|---|
| ***Sedimentary rock*** | کەڤری نیشتوویی: ئەو کەڤرەیە کە لە ئەنجامی رەقبوونی نیشتووەکانەوە کە لە چین چیندا کۆبوونەتەوە دروست دەبێت وەك بەردی لمی یان بەردی قوڕی یان بەردی چەوی.. هتد. یان ئەو کەڤرەیە کە کیمیاییانە دروست دەبێت وەك جیبسۆم کە لە نیشتنی گیراوە کیمیاییەکانەوە دەنیشێت، یان کەڤری ئەندامی وەك هەندێ بەردە کلس کە پێکهاتووە لە پاشماوەو پەیکەری گیانەوەران و رووەك. |
| ***Sedimentary structure*** | پێکهاتووی نیشتووی: ئەو پێکهاتووەیە کە لە کەڤرە نیشتووەکان دا دروست دەبێت لە کاتی نیشتنی کەڤرەکاندا (پێکهاتووی نیشتووی سەرەتایی) یان لە دوابەدوای نیشتندا (پێکهاتووی نیشتووی ناوەندی). |
| ***Sedimentation*** | نیشتن: بریتییە لە کرداری کۆبوونەوە یان دروست بوونی نیشتوو لە چینەکاندا. هەموو کردارەکانی جیابوونەوەی دەنکۆڵە یان پارچە کەڤریەکان و گوێزانەوەیان و نیشتنیان دەگرێتەوە، سەرەڕای ئەو کردارانەی کە دوای نیشتن بەسەر نیشتووەکاندا دێت. |
| ***Seepage*** | کرداری جوڵەی لەسەرخۆی ئاو یان هەر شلەیەکی تر (وەك نەوت) بەناو مادەیەکی کونیلەداردا کە بە هێواشی لەسەر رووی زەوی دەردەکەوێت. |
| ***Segment*** | پارچە، بەش |
| ***Segregation (Differentiation)*** | جیاکردنەوە:<br>-لە کەڤرزانیدا: بڕوانە جیاکردنەوەی ماگماتی ( Magmatic differentiation). یان کۆبوونەوەو چڕبوونەوەی کریستاڵەکانی خاوێك لە قۆناغە سەرەتاییەکانی جیاکاری ماگماتیدا.<br>-لە زانستی نیشتووەکاندا: دیاردەیەکی ناوەندییە کە بەهۆی دووبارە ریزبوونی کیمیاییەوە لەناو نیشتووەکاندا پاش نیشتنیان دروست دەبێت، وەك جیۆد. |
| ***Seismic*** | بوومەلەرزەیی |
| ***Seismic coefficient*** | هارکۆلکەی بوومەلەرزەیی |
| ***Seismogram*** | تۆمارگەی بوومەلەرزەیی: ئەو تۆمارگەیەیە کە بەهۆی ئامێری بوومەلەرزە پێوەوە تۆمار دەکرێت. |
| ***Seismograph*** | بوومەلەرزە پێو: ئەو ئامێرەیە کە تۆماری لەرەکانی زەوی دەکات بە تایبەتی بوومەلەرزەکان. |
| ***Seismology*** | زانستی زەمین لەرزە، بوومەلەرزەزانی، زەمین لەرزەزانی: زانستی لێکۆڵینەوەی بوومەلەرزە. |

Seis/Shap

| | |
|---|---|
| *Seismometer* | وەرگر: ئەو ئامێرەیە کە تێبینی جوڵەکانی زەوی دەکات. بریتییە لە بەشی وەرگر لە سیستەمی بوومەلەرزە پێودا. |
| *Self inductance* | هاندانی خۆیی |
| *Semiarid* | ئاووهەوای نیمچە وشك: ئەو ئاوو هەوایەیە کە کەمێك لە ئاوو هەوای وشك رادەی باران بارینی تیایدا زۆرترە (نزیکەی 10–20 ئینج). دەناسرێت بە بوونی سەوزای و رووەك تیایدا. |
| *Semi-crystalline* | نیمچە کریستاڵبوون |
| *Semiopaque* | نیمچە نووتەك |
| *Sensitivity* | هەستیاری |
| *Sensor* | هەستەوەر |
| *Separation* | جیاکردنەوە |
| *Septum* | بەربەست، کۆڵەکە: لە بووبەردزانیدا بەو بەربەستانە دەوترێت کە بە شێوەی تیشکی یان پانی یان درێژی لەناو سەدەفەی هەناو ریخۆڵەییەکان یان فۆرامنیفێرا یان پێ سەرییەکاندا هەیە و سەدەفە کە دابەش دەکات بۆ چەند ژوورێك. کۆکەی (septa)یە. |
| *Sequence* | لەدواییەك |
| *Series* | زنجیرە: یەکێکە لە یەکەکانی چینزانی کاتی کە لە سیستەم بچوکترەو لە قۆناغ گەورەترە. |
| *Sessile* | نەبزۆك: زاراوەیەکە بەکاردێت بۆ وەسفکردنی بوونەوەرانی کە لە شوێنی خۆیان جێگیرن و نابزوێن. |
| *Set* | دەستە |
| *Shadow zone* | ناوچەی سێبەر: لە بوومەلەرزە زانیدا بەو ناوچەیە دەوترێت کە زۆر بە کەمی شەپۆلە بیستراوەکانی پیا تێپەڕ دەبێت. ناوچەی نێوان 100° تا 140° لە چەقی رووی بومەلەرزەوە کە بەهۆی ناوچەی خێرای هێواش یان کرۆکی دەرەوە کە شەپۆلەکان پیایدا تێپەڕ نابێت دروست دەبێت. |
| *Shaking* | لەرانەوە |
| *Shale* | بەردە قوڕی توێیی: بەردێکی دەنکۆڵە وردی سەرییە کەفرە نیشتووە وردبووەکانە کە بەهۆی رەق بوونی قوڕ و قومەوە دروست دەبێت، دەناسرێت بە بوونی چینە زۆر تەنکەکان کە ئەستووریان لە نێوان 0.1ملم تا 0.4ملم دەبێت. |
| *Shape* | شێوە: شێوەی دەنکۆڵە وردبووەکانە کە بریتییە لە رێژەی دووریەکانی دەنکۆڵەکە. سێ دووری پێویست درێژی و پانی و ئەستووری دەبێت بپێورێت لەو شێوانە وەك شەشپاڵوو و رووتەختی... هتد. بەهەمان مانای particle shape دێت. |

| | |
|---|---|
| ***Shear folding*** | نوشتاوەی لەتبوو |
| ***Shear modulus*** | هاوکۆلکەی لەتبوون |
| ***Shear structure*** | پێکهاتووی دەفەیی |
| ***Sheet*** | پەڕە، سەرپۆش |
| ***Sheet structure*** | پێکهاتووی پەڕەیی |
| ***Shelf (continental)*** | شۆستەی کیشوەری: ئەو بەشەیە لە لێواری کیشوەرەکان کە دەکەوێتە نێوان هێڵی کەنار و لێژی کیشوەری یان تا قووڵی 200م. دەناسرێت بە بوونی لێژیەکی زۆر کەم (0.1°). بەهەمان مانای Continental shelf دێت. |
| ***Shell*** | سەدەفە، لەپکە، توێکڵ:<br>1–لە زەویناسیدا بە توێکڵی زەوی دەوترێت.<br>2–لە بووبەرد زانیدا بەو بەشە ڕەقە دەرەکییەی گیانەوەران دەوترێت کە لە زۆربەی کاتدا کلسییەو هەندێ جار سلیکی یان کایتینی دەبێت و دەوری گیانەوەرەکەی داوە. |
| ***Shelving*** | لێژی |
| ***Shield*** | زرێ: یەکەیەکی گەورەی پێکهاتنی توێکڵی زەوییە پێکهاتووە لە کەڤرە زۆر کۆنەکان (بەتایبەتی کەڤرەکانی پێش کامبری) لە کەڤرە گۆڕاو یان ئاگرییەکان. وەك زرێی کەنەدی و زرێی بەلتیك. بەهەمان مانای Craton دێت. |
| ***Shifting*** | لادان |
| ***Shining*** | درەوشاوە |
| ***Shoal*** | تەنکاو |
| ***Shock*** | راتەکان، لەرزین |
| ***Shore*** | کەنار، لێوار |
| ***Shore line*** | هێڵی کەنار |
| ***Shrinkage crack*** | درزی چوونەوەیەك: ئەو درزە بچوکانەیە کە لە نیشتووە دەنك بچوکەکان دا (وەك قوڕ) دروست دەبێت لە ئەنجامی ونکردنی ئەو ئاوەی کە تیایدایە. |
| ***Side*** | لا |
| ***Sial*** | سیاڵ: ناوێکی کەڤر زانیە بەکاردێت بۆ بەشی سەرەوەی توێکڵی زەوی، ئەو بەشەی کە سەرچاوەکەی ماگمای گرانایتییە. کورت کراوەی دوو وشەی Alumina + Silica یە. |
| ***Sieve*** | بێژنگ |
| ***Signal*** | نیشانە |
| ***Silex (Flint)*** | بەردە ئەستێ (بڕوانە flint ). |

| | |
|---|---|
| ***Silica*** | سلیکا ($SiO_2$). |
| ***Silicate*** | سلیکات: گرنگترین کۆمەڵەی خاوەکانە کە نزیکەی 95٪ ی توێکڵی زەوی پێکدەهێنێت (ئەگەر $SiO_2$ لەگەڵ ئەم کۆمەڵەدا بژمێردرێت). بەو پێکهاتووانە دەوترێت کە پێکهاتوون لە رەگی $(SiO_4)^{4-}$ سلیکاتی چوار لا بە شێوەی جیاجیا یان پێکەوە بەستراو یان زنجیرەی. |
| ***Silicification*** | بوون بە سلیکا: کرداری جێگرتنەوەی خاوەکانی تر لە لایەن سلیکاوە. |
| ***Silky*** | ئاوریشمی |
| ***Sill*** | بەربەستی ئاسۆیی |
| ***Silt*** | قوم: بریتییە لە پارچە یان دەنکۆڵەی زۆر ورد کە لە لمی زۆر ورد ورد ترەو لە قوڕی زبر گەورەترە واتە تیرەکەی لە نێوان 1/16ملم تا 1/256ملم دایە. |
| ***Silver*** | زیو: کانزایەکی رەنگ سپی نەرمە لە کانزا خاوێنەکانە، پێکهاتنی کیمیایی بریتییە لە (Ag). بە شێوەی دەمار لە کەڤرە ئاگری و نیشتووەییەکان دا هەیە. |
| ***Sima*** | سیما: ناوێکی کەڤر زانییە بەکاردێت بۆ بەشی ژێرەوەی توێکڵی زەوی، ئەو بەشەی کە سەرچاوەکەی ماگمای بازڵتییە. کورت کراوەی دوو وشەی Magnesia + Silica یە. |
| ***Similarity*** | لەیەك چوون |
| ***Sinistral*** | چەپڕەو:بریتییە لە پێچ خواردن یان جوڵان بە پێچەوانەی ئاراستەی خولی کاتژمێرەوە. |
| ***Sink*** | نوقم ئەبێت |
| ***Sinkhole*** | چاڵی رەحەتی شێوە یان قوچەکی |
| ***Sinter*** | نیشتووی کانیاوەکان: کەڤرێکی نیشتووی کیمیاییە بە شێوەی نیشتوویەکی رەق بە دەوری یان لەسەر کەڤرەکان لە کانیاوە گەرم یان ساردەکاندا دەنیشێت دوو جۆری سەرەکی هەیە نیشتووە سلیکییەکان و کلسییەکان (ترافەرتین) ئەم ناوە بە تەنها زیاتر دەلالەت لە جۆرە سلیکییەکەی دەکات. |
| ***Sinuosity*** | پێچاو پێچ |
| ***Site*** | شوێن |
| ***Size*** | قەبارە |
| ***Skeleton*** | پەیکەر |
| ***Skew*** | گۆشەدار |

| | |
|---|---|
| ***Skewness*** | سکوێنس: بریتییە لە چۆنیەتی هاوڕیەکییەکی شێواو یان بریتییە لە پێوانەی ناهاوڕیەکی کە یەکێکە لە هاوکۆلکەکانی شیکردنەوەی قەبارەیی دەنکۆڵەکانی کەڤرێك یان نیشتوویەك. |
| ***Slant*** | لاری |
| ***Slate*** | تەلە بەرد: کەڤرێکی گۆڕاوی دەنك بچوکی پەستراوە، لە کەڤری قوڕییەوە گۆڕاوە. |
| ***Slicken side*** | رووە لووسەکان: ڕوویەکی لووسی هێڵ هێڵ کراوە لە ئەنجامی لێکخشاندن لەسەر ڕووی لێکدابڕاو دروست دەبێت. |
| ***Slide (Sliding)*** | خزان: بریتییە لە خزانی تۆپەڵێك یان بارستاییەك لە بەفر یان کەڤر، بەهۆی شکاندنی زەوییەوە ڕوودەدات. جا لەوانەیە ئەو جوڵەیە کەم یان زۆر بێت. |
| ***Slipping surface*** | ڕووی خزان |
| ***Slope*** | لێژی: ڕووی لاری هەر بەشێك لە ڕووی زەوی، وەك لێژی گرد. |
| ***Slumping*** | خزان: بریتییە لەو خزانە کە دەناسرێت بە بوونی جوڵەیەکی قەصی و هەڵگەڕاوە بۆ بارستاییەك لە کەڤر یان لە زەوی ، یان گواستنەوەی بەهۆی هێزی کێشکردنی زەوییەوە. وەك پێکهاتنێکی نیشتووی ئەو پێکهاتنە پێچخواردووەیە کە لە ئەنجامی جوڵەی تەنێکی نیشتوو دروست دەبێت لە شوێنێکی لێژو سەریەرەوخواردا. |
| ***Smelting*** | توانەوە، شلبوونەوە |
| ***Smoothing*** | ڕێککردن |
| ***Smudge*** | پیسی |
| ***Snail*** | لوولپێچ |
| ***Snow*** | بەفر |
| ***Soapstone*** | بەردی سابون: ناوێکە بەکاردێت بۆخاوی تالك ،هەروەها ناوێکی کەڤری گۆڕاوە کە بەشێوەی تۆپەڵ یان شستۆز یان ریشاڵییەو نەرمە بەشێوەیەکی سەرەکی لە تالك پێکهاتووە سەرەڕای مایکا و کلۆرایت وئەمفیبۆل و پایرۆکسین. |
| ***Soft*** | نەرم |
| ***Soft mineral*** | خاوی نەرم: ئەو خاوەیە کە لە کوارتز نەرم تر بێت واتە ڕەقێتییەکەی لە (7) کەمتر بێت بەپێی پێوەری مۆهس بۆ ڕەقێتی. |
| ***Soil*** | خۆڵ: لەزەویناسی ئەندازیاریدا ئەو مادە ڕەقنەبووەیە کە لەسەر کەڤرەکان هەیە . لە خۆڵزانیدا ئەو ناوەندە سروشتییەیەکە ڕووەك تیایدا دەڕوێت و لە ئەنجامی کەشاندنەوە دروست دەبێت. بڕگەیەکی ستوونی لە خۆڵ تا کەڤر دەناسرێت بە بڕگەی خۆڵ. |

Soil/Spec

| | |
|---|---|
| *Soil creep* | خۆڵخشان |
| *Soil profile* | لابرگەیەکی خۆڵی |
| *Solar system* | کۆمەڵەی خۆر:پێکهاتووە لەخۆرو نۆ هەسارەکەی. |
| *Solfataras* | کانگەی گۆگرد |
| *Solidification* | رەقبوون: کرداری رەقبوون، بەتایبەتی گۆڕان لە دۆخی شلەوە بۆ رەق لەکاتی ساردبوونەوەی ماگمادا. |
| *Solidity* | رەقی |
| *Solitary* | بەتەنیا، داپچڕاو |
| *Solubility* | توانای توانەوە |
| *Solution* | شلاوک |
| *Solvent* | توێنەرەوە |
| *Sonic sounding* | ئامرازی دەنگدار بۆ پێوانی قووڵایی |
| *Sorting* | جیاکردنەوە: کردارێکی داینامیکییە کە دەنکۆڵەی نیشتووەکان هەمان سیفەتیان هەبێت وەك هاویەکی لە قەبارە یان شێوە یان کێشی جۆری کە بە سروشتی بەهۆی هۆکاری گواستنەوە وە دروست بووە. |
| *Sour* | ترش |
| *Source* | سەرچاوە |
| *Space lattice* | تۆڕە بۆشایی یان ریز بوونی کریستاڵی: بەهەمان مانای Crystal lattice دێت. |
| *Spar* | سپار: زاراوەیەکە بەکاردێت بۆ ئەو خاوانەی کە رەنگیان سپی و رووناك و ناکانزایی وبلوورین وەك کالسایت و فلۆرایت. |
| *Species* | جۆر: لە بووبەرد زانیدا بەو کۆمەڵە بوونەوەرە (گیانەوەر یان رووەك) دەوترێت کە دەتوانن زاووزێ بکەن و نەوەی وەك خۆیان لە رووی شێوەو پێکهاتن و کردارەوە دروست بکەن. یەکەی سەرەکی پۆلێنکردنە لە رەگەز بچوکترە. بەگشتی ناوی جۆر دەبێت دووانە بێت واتە ناوی رەگەزەکە دەنوسرێت پاشان بەدوایدا ناوی جۆرەکە. |
| *Specific* | جۆری، دیاریکراو |
| *Specification* | دیاریکردن |
| *Specific gravity* | کێشی جۆری: بریتییە لە رێژەی نێوان کێشی ماددەیەکی رەق یان شل بۆ کێشی هەمان قەبارە لە ئاو. |
| *Specimen* | نموونە |
| *Spectra* | شەبەنگی |
| *Spectroscope* | شەبەنگ پێو |

| | |
|---|---|
| ***Spectrum*** | شەبەنگ |
| ***Speleology*** | زانستی ئەشکەوتەکان |
| ***Sphenoid*** | ئەسفینی: شێوەیەکی کراوەی کریستاڵەکانە کە دوو رووی ناتەریبی هەیە کە هاویەکن بۆ تەوەرەی هاویەکی. لە کریستاڵەکانی پۆلی ئەسفینی سەر بە رژێمی یەکلاریدا هەیە. |
| ***Sphere*** | گۆ: شێوەیەکی پێوەرییە لە پێوانەی شێوەی دەنکۆڵەکاندا. |
| ***Sphericity*** | گۆیی: بریتییە لە پەیوەندی نێوان دوورییەکانی (درێژی و پانی و ئەستووری) دەنکۆڵەکان بە تایبەتی نزیک بوونەوەی شێوەی دەنکۆڵەکان لە شێوەی گۆیی. پلەی گۆیی گۆ بریتییە لە (1)، هەموو شتێکی تر پلەی گۆییەکەی لە یەك کەمترە ، نابێت لەگەڵ لووسیدا تێکەڵ بکرێت. |
| ***Spheroidal*** | نیمچە گۆیی |
| ***Spicule*** | درکۆلە: بریتییە لە پیکهاتووی زۆر وردی کلسی یان سلیکی بەشێوەی درك لەسەر لەشی هەندێ لە گیاندارە بێبڕبڕەکان هەیە وەك ئەسفەنجییەکان و تیشکدارەکان. |
| ***Spill*** | داڕشتن |
| ***Spines*** | درك |
| ***Spiral*** | لوولپێچی، پێچ خواردوو |
| ***Spirifens*** | پێچ خواردووەکان |
| ***Splitting*** | شەبەقبردن |
| ***Sponges*** | ئیسفنجیەکان (بڕوانە وشەی Porifera). |
| ***Spontaneous*** | خۆیی |
| ***Spore*** | هەلاڵە: بریتییە لەو تەنە یەك خانەییە زۆر بوونانەی کە لە بارودۆخێکی تایبەتی و گونجاودا دەتوانێت بوونەوەرێکی نوێ دروست بکات. |
| ***Spouting*** | هەڵقوڵاو |
| ***Spread*** | بڵاودەکاتەوە |
| ***Spring*** | کانیاو: ئەو شوێنەیە کە ئاوی ژێر زەوی بەشێوەیەکی سروشتی دێتە سەر رووی زەوی. پەیوەندی هەیە بە ئاستی ئاوی ژێر زەوی و جۆری کەڤرەکان و بەرزای و نزمای رووی زەوی. |
| ***Sprinkle*** | پرژە |
| ***Spume*** | کەف |
| ***Squamate*** | پوولەکەیی |
| ***Stable*** | جێگیر |
| ***Stadia*** | پێوەر |

| | |
|---|---|
| *Stage* | قۆناغ: یەکەیەکی جیۆلۆجییە، هەروەها یەکەیەکی چینزانی – کاتییە لە زنجیرە بچوکترە. بەو کەڤرانە دەوترێت کە لە تەمەنی جیۆلۆجی دیاریکراودا نیشتوون. |
| *Stagnant* | وەستاو |
| *Stagnation point* | پنتی وەستان |
| *Staining* | بۆیەکردن |
| *Stalactite* | ستالاکتایت، داکەوتەکان: بریتییە لە نیشتوویەکی کلسی شێوە قوچەکی هەڵگەڕاوە کە لە سەری ئەشکەوتەکانەوە بەرەو خوارەوە دروست دەبێت لە ئەنجامی دڵۆپاندنەوە دروست دەبێت. |
| *Stalagmite* | ستالاگمایت، سەرکەوتەکان: بریتییە لە نیشتوویەکی کلسی شێوە قوچەکی کە لە بنی ئەشکەوتەکانەوە بەرەو سەرەوە لە ئەنجامی دڵۆپاندنەوە دروست دەبێت. |
| *Standard deviation* | لادانی پێوانەیی: بریتییە لە رەگی دووجای تێکڕای دووجای هەموو ئەو لادانانەی کە لە ناوەڕاستی کۆمەڵێك لە ژمارە لادەدەن. پێوەری ئامارانەی بڵاوبوونەوەیە. یەکێکە لە هاوکۆلکەکانی شیکردنەوەی قەبارەی دەنکۆڵەکان. |
| *Star* | ئەستێرە |
| *Star fish* | ئەستێرەی دەریا |
| *Starved basin* | ئاوزێڵی برسی: ئەو ئاوزێڵە نیشتووییەیە کە رێژەی دابەزین یان قووڵ بوونی زۆرترو خێراترە لە رێژەی ئەو نیشتووانەی کە دێتە ناوی ، ئەستووراى نیشتووەکان لە لێواری ئاوزێڵەکە زۆر ترە وەك لەناوەراستەکەی. |
| *Statistic* | ئامار |
| *Steel* | پۆڵا ، سەخت |
| *Steep* | زۆر لێژ |
| *Stellated structure* | پێکهاتووی ئەستێرەیی |
| *Stelleroid* | ئەستێرۆکەکان |
| *Step* | پلە |
| *Stereographic* | ئەندازەیی |
| *Stereoscope* | دووربینی ئەندازەیی |
| *Sterile* | نەزۆك |
| *Sticky* | لکێنەر |
| *Stock* | کۆکراوە |
| *Stododcum* | گەروو |
| *Stone* | بەرد |

| | |
|---|---|
| *Stone- age* | چاخی بەردین |
| *Stony meteorite* | نەیزەکی بەردی ، بەردە ئەستێرە |
| *Storage* | کۆکردنەوە |
| *Storm* | رەشەبا، گێژەڵووکە |
| *Straight* | راست |
| *Strain* | جێفشار: بریتییە لە گۆڕان لە شێوە یان قەبارەی تەنێك کە لە ئەنجامی فشارەوە دروست دەبێت. دەناسرێت بە رێژەی نێوان بڕی گۆڕان بۆ شێوە یان قەبارەی بنچینەیی. |
| *Strand* | کەنار |
| *Strata* | چینەکان |
| *Stratification* | چینبوون: پێکهاتن و کۆبوونەوە یان نیشتنی مادە لە شێوەی چیندا. هەروەها ئەو پێکهاتووەی کە لە ئەنجامی نیشتنی نیشتووەکاندا چین دروست دەبێت. |
| *Stratified* | چینبوو |
| *Stratigraphic trap* | حەشارگەی چینی: بەو حەشارگەیە دەوترێت کە زیاتر لە ئەنجامی گۆڕانی جۆری کەڤرەوە دروست دەبێت وەك لە هۆکاری بنیاتنەر یان دروستکەر. |
| *Stratigraphy* | چینزانی: لقێکی زانستی زەوی ناسییە کە دەکۆڵێتەوە لە پێناسەکردن و وەسفکردنی یەکە بچوك و گەورەکانی کەڤرەکان (بەتایبەتی کەڤرە نیشتووەکان بەڵام کەڤرە ئاگری و گۆڕاوەکانیش بەدەر نین) جا ئەو کەڤرانە دەرکەوتووبن یان لە ژێر زەویدا. لێکۆڵینەوە هەموو لایەنەکانی چینەکان لە شێوەو ئەستووری و پۆلێنکردن و پەیوەندی نێوانیان و چۆنێتی دروست بوونیان و کۆنی و تازەو بەدوایییەکی دەکۆڵێتەوە. |
| *Stratospher* | بەرگە هەوای سەروو |
| *Stratum* | چین |
| *Streak* | رەنگی رووشان: لە خاوەکاندا رەنگی هاڕاوەی خاوە، دەتوانرێت بەهۆی لێکخشاندنی خاوەکە بە پارچەیەك پۆرسیلیندا بەدەست بکەوێت. ئەم رەنگە زیاتر جێگیرە وەك لە رەنگی ئاسایی خاوەکە بۆیە بەسوودە لە ناسینەوەی خاوەکاندا. |
| *Stream* | ئاوەڕۆ |
| *Strength* | بەرگری: گەورەترین فشارە کە تەنێك بەرگەی دەگرێت پێش شکاندنی بەهەمان یەکەکانی فشار دەپێورێت. |
| *Stress* | فشار: بریتییە لە هێزێکی ئاراستەکراو بۆ یەکەیەکی رووبەر، کە دەیەوێت شێوەی تەنەکە بگۆڕێت. یەکەکانی وەك تەن بۆ هەر ئینچ دووجایەك یان کیلۆگرام بۆهەر سانتیمەتر دووجایەك. |

| | |
|---|---|
| ***Strike*** | لێدەر: بریتییە لە ئاراستەی هەر ڕوویەکی پێکهاتن یان هەر چینێك، یان بریتیە لە ئاڕاستەی ئەو ڕووە خەیاڵییەی کە لە ئەنجامی یەکتربڕینی هەر ڕوویەك لەگەڵ ڕووتەختێکی ئاسۆیدا دروست دەبێت. |
| ***Stringer*** | دەماری کانزایی |
| ***Structural basin*** | ئاوزێڵی پێکهاتن |
| ***Structural geology*** | جیۆلۆجیای پێکهاتن: ئەو لقەیەلە زانستی زەویناسی کە لە شێوەو ڕیزبوون و پێکهاتنی ناوەوەی کەڤرەکان دەکۆڵێتەوە بە تایبەتی وەسفکردن و پۆلێنکردن و دیاریکردنی پێکهاتنەکانی وەك چینە چەماوەکان و لێکترازاوەکان و نێوانە ڕووەکان. |
| ***Structure*** | پێکهاتن |
| ***Style*** | شێواز |
| ***Stylolite*** | هێڵەکانی توانەوە: بریتییە لەو ڕووە تەنکە شێوە ناڕێك و پێکەی (شێوەی دەمی مشار) کە بە زۆری لە کەڤرە کلسییەکاندا بڵاوە و هەروەها لە هەندێ بەردی لمیدا دەبینرێت. بەگشتی ئەو ڕووە دەبێتە شوێنی کۆبوونەوەی مادە نەتواوە بەجێماوەکانی (وەك قوڕو ئۆکسیدی ئاسن) ناو کەڤرەکە هەروەها ئەم ڕووانە تەریبن بە چینەکان. بڕوا وایە کە ئەم پێکهاتنانە بەهۆی پەستان وتواندنەوەوە دروست دەبێت. |
| ***Sub base*** | بنەچین |
| ***Subhedral*** | ڕوو ناتەواو |
| ***Subjective*** | بابەتی |
| ***Sublimation*** | هەڵچوون |
| ***Sub marine*** | ژێر دەریایی |
| ***Submerged*** | نوقم بوو |
| ***Subsidence*** | دابەزین، تەپین |
| ***Subsidiary*** | ناوەنجی، یاریدەدەر |
| ***Subsiding area*** | ناوچەی دابەزیو |
| ***Substitution*** | گۆڕین |
| ***Substratum*** | بنەچین |
| ***Subsurface*** | ژێر ڕووی زەوی |
| ***Subtype*** | نموونەی ناوەندی |
| ***Subway*** | تونێل |
| ***Succession*** | دواییەك: لە چینزانیدا بریتییە لە ژمارەیەك لە یەکەی کەڤری یان چەند چینێك کە ڕیز بوونیان بەپێی تەمەنی جیۆلۆجیە. |

Suga/Swal

| | |
|---|---|
| ***Sugary grain*** | شەکرە دەنکۆڵە |
| ***Suite*** | دەستە |
| ***Sulfur ,Sulphur*** | گۆگرد :خاوێکی یەك توخمی ناکانزاییە، هێمای کیمیاییەکەی (S)ە، لەسەر رژێمی لەبزینەیی دەبێت بە کریستاڵ و رەنگی زەردەو لەگەڵ چینەکانی بەردی کلسیدا هەیە. |
| ***Summation*** | کۆکردنەوە |
| ***Summit*** | لوتکە |
| ***Sun*** | خۆر |
| ***Sunken*** | نوقم بوو |
| ***Superficial layer*** | رووەچین |
| ***Super incumbent*** | لەسەر یەککەوتوو |
| ***Superposition*** | بەدوای یەکهاتن: بریتییە لە بەدوایەکهاتنی چینەکان کە بە سروشتی دەنیشێت بەجۆرێك چینەکانی ژێرەوە لە تەمەندا کۆنترن لە چینەکانی سەرەوە. یان ئەو کردارەیە کە چینە بەدوایەکهاتووەکانی پێدەنیشێت. هەروەها بڕوانە Law of superposition. |
| ***Supplementary*** | تاوەنجی |
| ***Support*** | کۆڵەکە |
| ***Surface*** | روو: بریتییە لە بەشی دەرەوەی زەوی رەق بێت یان شل یان ئەو رووە دوو دوورییەیە کە دەکەوێتە نێوان دوو دیاردە یان پێکهاتنی جیۆلۆجیەوە. |
| ***Surface tension*** | راکێشانی روویی |
| ***Surface wave*** | شەپۆلی روویی: ئەو شەپۆلە بوومەلەرزەییانەیە کە یە بەسەر رووی زەویدا یان تەریب بە رووی زەوی بڵاودەبنەوە. هەروەها بە هەمان مانای L. Wave دێت. |
| ***Surge*** | دەربەڕین |
| ***Survey*** | پێوان |
| ***Surveyor*** | زەویپێو |
| ***Suspended water*** | ئاوی هەڵواسراو (بەهەمان مانای Vadose water) دێت. |
| ***Suture*** | درز: لە بووبەردزانیدا هێڵی پێکەوە بەستنی بەربەست لەسەدەفەی پێسەرییەکان دا لەگەڵ رووی ناوەوەی دیواری سەدەفەکە. زۆر جار هێڵێکی پێچاوپێچە و نەخشی تیادایە وەك لە ئەمۆنۆیدا. هەروەها لە پێسکییەکاندا بە هێڵی پێکەوە بەستنی ژوورەکان دەوترێت. |
| *Swale* | نزمایی |

*Swal/Syst*

**Swallow hole** — بیری قوولی پڕ ئاو

**Swamp** — زەلکاو

**S- wave** — شەپۆلی ناوەندی: جۆرێکە لە شەپۆلە بوومەلەرزەییە تەنییەکان کە بڵاوبوونەوەی بەشێوەی جوڵەیەکی قەصییە، هەر بۆیەش لەرەلەرەکەی ستونە لەسەر ئاڕاستەی بڵاوبوونەوەکەی. ئەم جۆرە شەپۆلە تێپەڕ نابێت بەناو شلەمەنیدا یان بەناو بەشی دەرەوەی کرۆکی زەویدا.

**Sweep** — رایدەماڵێت

**Syenite** — سیانایت ، سینایت : کەڤرێکی ئاگرینە کە لە قووڵاییە ناوەندییەکاندا دروست دەبێت بەشێوەیەکی سەرەکی فلدسبارە ئەلکالیەکانی تیایە وەك ئۆرثۆکلیز و مایکرۆکلاین، بەشێکی کەم لە بلاجیۆکلیز و خاوە مافیەکان ، سەرەڕای بوونی کوارتز بە رێژەیەکی کەم.

**Symmetry** — هاوتایی ، چونیەکی: لە بلووزانیدا بریتییە لە شێوەی دووبارە بوونەوەی هەمان رووی کریستاڵی کە ئەمەش دەلالەت لە ریز بوونی ناوەوەی مادە کریستاڵییەکە دەکات.

**Synchronism** — هاوکات

**Synclinal** — چاڵی: بریتییە لە شێوەی چاڵە توێ یان چینە چەماوە چاڵەکان.

**Syncline** — چینە چەماوە چاڵەکان: ئەو چینە چەماوەیە کە کرۆکەکەی، لە رووی چینزانییەوە، چینەکانی تازەترن وەك لە چینەکانی لاکانی، هەروەها بە شێوەی چاڵ دەبێت. دژی وشەی چینە چەماوە کووڕەکانە (Anticline)ە.

**Synclinorium** — چینە چەماوە ئاڵۆزەکان: بریتییە لە چەند چینە چەماوەیەك کە پێکەوە چینە چەماوەیەکی ئاڵۆز دروست دەکەن کە ناوچەیەکی گەورە دەگرێتەوەو لە ناوەوە چەندەها چینە چەماوەی نا سەرەکی تیادایە.

**Syngensis** — یەك بنەچە

**Synonym** — هاو واتا هاوتا: ئەگەر لەیەك کاتدا دوو وشە بەکارهێنرا بۆ هەمان مەبەست ئەوا بەو دوو وشەیە دەوترێت هاو واتا یان هاوتا.

**Synthesis** — پێکهێنان

**System** — رژێم: کۆمەڵێك دیاردەی سروشتی و پەیوەندیدار بەیەکەوە، وەك لێکدابڕاوەکان. لەچینزانیدا بریتییە لە یەکەی سەرەکی چین زانی کاتی کە گرنگییەکی جیهانی هەیە و لە یەکە بنچینەییەکانی دابەشکردنی کەڤرەکانی چەرخی دەرکەوتنی ژیانە. هەروەها بەو کەڤرانە دەوترێت کە لە ماوەیەکی جیۆلۆجی دا نیشتوون.

**Systematics** — پۆلینزانی (بەهەمان ماناى Taxonomy) دێت.

# -Tt-

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| *Table land* | بان: (بە هەمان ماناى وشەى *plateau* ) دێت. |
| *Tabulata* | پەڕەییەکان |
| *Talc* | تالك:خاوێکی زۆر نەرمی سپی یان شین باو یان خۆڵە مێشییە لەسەر ڕژێمی یەکلاریی دەبێت بە کریستاڵ و پێکهاتنی کیمیایی $Mg_3\ Si_4\ O_{10}\ (OH)_2$ هەیە. پلەی ڕەقێتییەکەی (1) لەسەر پێوەری مۆهس. لە کەڤرە ئاگرییەکان یان بەهۆی کرداری گۆڕانەوە دروست دەبێت و بەشێوەی ریشاڵی یان دەنکۆڵەیی یان پەڕە پەڕەی هەیە، وەك بۆدرە بەکاردێت. |
| *Talus* | کەڵەکە بەرد: بریتییە لەو پارچە بەردانەی بچوك یان گەورە (بەتایبەتی گەورەو گۆشەدار) کە لەسەر ڕووە لێژەکانەوە دێنە خوارەوەو لەبنی ئەو ڕووانەدا کۆدەبنەوە. بەهەمان ماناى Scree دێت. |
| *Tanacity* | یەککگری، توندی |
| *Tangence* | لێکەوت |
| *Taphrogensis* | تەپین، دابەزین: زاراوەیەکی گشتییە بەکاردێت بۆ دروست بوونی دیاردەی دابڕان یان شەقبوون، دەناسرێت بە بوونی گۆشەیەکی گەورە یان لێکدابڕاوی گەورەو هەروەها داچوون. |
| *Tar* | قیر |
| *Taxodont* | ددانی دابەشبوو |
| *Taxonomy* | پۆلینزانی: بریتییە لە کرداری پۆلێنکردنی بوونەوەران (ڕووەك یان گیانەوەر) بەهەمان ماناى Systematics دێت. |
| *Technique* | تەکنیکی |
| *Technology* | تەکنەلۆژی |
| *Tectofacies* | شێوازی تەکتۆنی: بریتییە لە شێوازی کەڤری کە لە ڕووی تەکتۆنییەوە شیدەکرێتەوە. |
| *Tectonic* | دروستکەر، تەکتۆنی: بەو هێزە دەوترێت کە دەبێتە هۆی دروست بوونی دیاردەو پێکهاتنەکان، بەهەمان ماناى Geotectonics دێت. |
| *Tectonophysics* | فیزیای تەکتۆنی |
| *Tectum* | توێکل |
| *Tectites* | ئەیزەکی شوشەیی ، بەردە ئەستێرەی شوشەیی |

Tels/Tetr

| | |
|---|---|
| ***Telson*** | کلکە دڕك |
| ***Temprate zone*** | ناوچەی مامناوەندی |
| ***Temporary*** | کاتی |
| ***Temperature*** | پلەی گەرمی، گەرمی |
| ***Tensile strength*** | بەرگری راکێشان: بریتییە لە گەورەترین فشاری راکێشان کە تەنێك بەرگەی دەگرێت پێش شکاندنی. |
| ***Tensile stress*** | فشاری راکێشان: بریتییە لەو فشارە ستونیەی کە هەوڵ دەدات ئەو تەنەی کە کاری لەسەر دەکات بیکات بە دوو پارچەوە. |
| ***Tension*** | راکێشان، گرژی: ئەو بارەی فشارە ، کە تیایدا فشاری راکێشان تیایدا زاڵە ،ئەو فشارەی کە دەیەوێت تەنەکە رابکێشێت و بیکات بە دوو پارچەوە. |
| ***Terminal*** | کۆتایی |
| ***Terra*** | خاك، خۆڵ |
| ***Terraces*** | تێرەیس (بڕوانە river terrace). |
| ***Terrain*** | ناوچە |
| ***Terra rosa*** | خۆڵی سوور، گلە سوور: خۆڵێکی رەنگ سووری بەجێ ماوە وەك کەوڵێك بەسەر چینەکانی بەردی کلسەوە، بەتایبەتی لەو ناوچانەی کە دیاردەی کارستی زۆرە. |
| ***Terrestrial*** | وشکایی، خاکی |
| ***Terrigenous sediment*** | نیشتووی خاکی: نیشتووە دەریاییە تەنکاوەکانە کە پێکدێت لەو مادانەی کە لە وشکانییەوە دادەماڵرێن. |
| ***Tertiary period*** | ماوەی سیانی: یەکەم ماوە لە چاخی ژیانی نوێدا. لە دوای ماوەی کریتاشیەوە لە چاخی ژیانی ناوەڕاستدا و لە پێش ماوەی چوارییەوە دێت. واتە لە نزیکەی 65 ملیۆن ساڵ لەمەوبەرەوە دەست پێ دەکات تا دوو- سێ ملیۆن ساڵ پێش ئێستا. دابەش دەبێت بۆ چەند سەردەمێك کە بریتین لە پالیۆسین و ئیۆسین و ئۆلیگۆسین و مایۆسین و پلایۆسین. |
| ***Test*** | لەپکە |
| ***Tethys*** | تیشس: دەریای تیشس، ئەو دەریا گەورەیە بوو کە بۆ ماوەیەکی زۆر لە چاخی ژیانی ناوەڕاستدا دروست بوو بوو لە نێوان هەردوو کیشوەرە گەورەکانی لۆراشیا و گۆندوانا دا. ناوچەکانی خوارووی ئەورووپاو دەریای ناوەڕاست و سەرووی ئەفریکا و ئێران و ناوچەی هیمالایەی داپۆشیبوو. واتە بە درێژایی شاخەکانی ئەلپاین و هیمالایا. |
| ***Tetra coral*** | شیلانە چوارییەکان: بەهەمان مانای rugose coral دێت. |

| | |
|---|---|
| *Tetragonal system* | رژێمی چوار لا: یەکێکە لە شەش رژێمەکەی بوون بە کریستاڵ کە دەناسرێت بە بوونی سێ تەوەرەی ئەستوون لەسەر یەك و بەڵام تەوەرە ستونی‌یەکە جیاوازە لە درێژیدا لەگەڵ دوو تەوەرە یەکسانەکەی تر. |
| *Tetrahedron* | چوار روو |
| *Texture* | رەشتە: بریتییە لە پەیوەندی نێوان دەنکۆڵەی خاوەکانی کە پێکەوە کەڤر دروست دەکەن. زاراوەی پێکهاتن بە گشتی بۆ دیاردە گەورەکانی کەڤر بەکاردێت بۆیە نابێت لەگەڵ تنراودا تێکەڵ بکرێت. |
| *Thanatocenosis* | پێکەوە نەژیاو: بریتییە لە کۆمەڵێك بوو بەرد کە پێکهاتوون لە پاشماوەی ئەو بوونەوەرانەی کە لە کاتی ژیانیاندا پێکەوە نەژیاون. ئەم پاشماوانە بەگشتی پاش مردنی بوونەوەرەکە بەهۆی هۆکاری گواستنەوەوە گواستراونەتەوە. |
| *Theca* | بەرگ |
| *Theoretical* | تیۆری |
| *Thermal* | گەرم، گەرمی |
| *Thermal springs* | کانیاوە گەرمەکان |
| *Thermometer* | گەرمیپێو |
| *Thermo scope* | گەرمیدۆز |
| *Thick* | ئەستوور |
| *Thickness* | ئەستووری |
| *Thin* | تەنك، باریك |
| *Thin section* | برگەی تەنك |
| *Thorax* | سنگ: بەشی سنگ لە پێجومگەییەکاندا وەك ترایلۆبایت. |
| *Three fold* | سیانی |
| *Throw* | لادانی ستوونی: پێوانەی ئەو لادانە ستوونییەی کە لەنێوان لای دابەزیو ولای سەرکەوتووی لێکترازاودا دروست دەبێت. |
| *Thrust fault* | لێکترازاوی پاڵنراو یان هەڵگەڕاوە (بڕوانە Reversed fault). |
| *Tidal zone* | ناوچە یان پشتێنەی هەڵکشان و داکشان: بریتییە لەو ناوچەیەی کە دەکەوێتە نێوان هەڵکشان و داکشانی ئاوی دەریاو کەنداوەکانەوە. |
| *Tide* | هەڵکشان و داکشان: بریتییە لە بەرزبوونەوەو نزم بوونەوەی رێك و پێکی ئاستی رووی ئاوی ئۆقیانووس و دەریا و ئەو تەنە ئاویانەی کە پێوەی بەستراون (وەك کەنداوەکان) کە بە گشتی لە رۆژێکدا دوو جار روو دەدات لەسەر رووی زۆربەی گۆی زەوی و لە ئەنجامی کێش کردنی مانگەوە (بە پلەیەکی کەمتر بەهۆی خۆرەوە) روو دەدات کە بە شێوەیەکی نا یەکسان کار دەکاتە سەر ناوچە جیاجیاکانی زەوی سووڕاوە. |

| | |
|---|---|
| **Tight** | توند و تۆڵ |
| **Till** | پاشماوەی رووباری سەهۆڵی یان بەفراوەر: بریتییە لە ناوچەیەکی جیانەکراوەو شێوە تۆپەڵ (بێچین) کە بەگشتی رەق نەبووە و پێکهاتووە لە تێکەڵەیەك لە قوڕ و لم و چەو و چەوی زۆر گەورە جیاواز لە قەبارەو شێوەدا کە لە ئەنجامی چالاکی بەفراوەرەوە دروست بووە. |
| **Tillite** | تیلایت: کەڤرێکی نیشتووی رەقە لە ئەنجامی رەق بوونی پاشماوەی رووباری سەهۆڵییەوە دروست دەبێت. |
| **Time correlation** | پێکەوە بەستنی کاتی |
| **Time scale** | خشتەی کاتی: بەهەمان مانای کاتپێوی جیۆلۆجی دێت. |
| **Time unit** | یەکەی کات |
| **Tin** | تەنەکە : توخمێکە هێما کیمیاییەکەی Sn. |
| **Tolerance** | هەموار کردن |
| **Tool** | ئامراز |
| **Topaz** | یاقوتی زەرد، تۆپاز: خاوێکی بێڕەنگ یان زەرد یان سپی لەسەر رژێمی لەبزینەیی دەبێت بە کریستاڵ و پێکهاتنی کیمیایی $Al_2$ $SiO_4 (F, OH)_2$ بەشێوەی کریستاڵی مەوشووری لە کەڤرە ئاگرییە سلیکییەکاندا هەیە. رەقێتییەکەی یەکسانە بە (8) لەسەر پێوەری مۆهس. |
| **Topographic map** | نەخشەی بەرزونزمی |
| **Topography** | بەرزی و نزمی: شێوەی گشتی سەر رووی وشکانی یان هەر پارچەیەکی تری سەر رووی زەوی وەك بەرزی و نزمی و دیاردە دەسکردەکان دەگرێتەوە. |
| **Top set bed** | چینەکانی لوتکە |
| **Tornado** | گێژەلووکەی دەریایی |
| **Torrent** | لێشاو |
| **Torsion** | خواربوونەوە، چەمانەوە |
| **Torsion coefficient** | هاوکۆلکەی چەمانەوە |
| **Tortuosity** | خواروخێچی |
| **Toughness** | تۆکمەیی |
| **Tourmaline** | تۆڕمالین: کۆمەڵێك خاوی سلیکاتیئەلقەیین. بەگشتی لەناو کەڤرە ئاگرییە ترشەکاندا بڵاوە سەرەڕای کەڤرە گۆڕاوەکان وەك نایس. رەنگەکەی زۆر جیاواز و گۆڕاوە. دەتوانرێت بیڕێت و وەك بەردە بەنرخەکان(گەوهەر) بەکاربهێنرێت. |
| **Tower** | قوللە |

Trac/Trav

| | |
|---|---|
| ***Trace*** | شوێنەوار |
| ***Trace element*** | توخمی شوێنەوار توخمی نا سەرەکی: ئەو توخمەیە کە لە پێکهاتنی خاودا سەرەکی نییە، بەڵام بەرێژەیەکی زۆر کەم (بەگشتی 1٪ کەمتر) لە ناو پێکهاتنی خاوەکەدا هەیە. |
| ***Trace fossil*** | شوێنەواری بەبەردبوو: پێکهاتنێکی نیشتووی بە پێکهاتووە لە شوێنەواری بەبەردبوو وەك شوێن پێ و کونکردن و کون کە لە ئەنجامی چالاکی لە کاتی زیندوی گیانەوەرەکەدا دروست دەبێت. هەروەك ئەو شوێنەوارانەی کە لە کاتی خشان و ڕۆیشتن و خواردن و خۆشاردنەوەو راکردن و حەوانەوەی گیانەوەرەکە لەسەر نیشتووە رەق نەبووەکان بەجێ دەمێنێت. |
| ***Track*** | شوێن پێ: جۆرێکە لە شوێنەواری بەبەردبوو. |
| ***Trachyite*** | تراخایت : جۆرێکە لەکەڤری ئاگری . |
| ***Traction*** | راکێشان |
| ***Trail*** | شوێنپێ |
| ***Transcrystalline crack*** | شەقبردنی ناوکی کریستاڵ |
| ***Transcurrent fault*** | پانە لێکترازاو |
| ***Transformation*** | گۆڕان، گۆڕین |
| ***Transgression*** | تێپەڕینی دەریا: داپۆشینی ناوچەیەکی وشکانی بەهۆی ئاوی دەریاوە لە کاتێکی جیۆلۆجی کورتدا. واتە بەرەو پێش چوونی ئاوی دەریا بەرەو وشکانی کە لە ئەنجامی بەرزبوونەوەی ئاستی رووی دەریاوە یان نزم بوونەوەی وشکانییەوە روودەدات. |
| ***Translation gliding*** | گواستنەوە خزان |
| ***Translucent*** | نیمچە روون: بەو خاوە دەوترێت کە رێ بە تێپەڕبوونی رووناکی دەدات بەڵام زۆر روون نییە. |
| ***Transparent*** | روون: بەو خاوە دەوترێت کە توانای تێپەڕکردنی رووناکی هەیە بەجۆرێك کە دەتوانرێت بەناویدا شتەکەی ئەودیوی ببینرێت. یەکێکە لە سیفاتە فیزیاییەکانی خاوەکان کە سوودی هەیە لە ناسینەوەی خاوەکاندا. |
| ***Transportation*** | گواستنەوە |
| ***Transverse wave*** | پانە شەپۆل (بڕوانە زاراوەی S- Wave). |
| ***Trap*** | حەشارگە: بەشوێنی کۆبوونەوەی ئاو یان نەوت دەوترێت. |
| ***Traverse*** | رێڕەو، رێچکە: لە پێوانە زانیدا، رژێمی پێوانەکردنی درێژی و ئاراستەی ئەو هێڵانەی کە چەند خاڵێکی پێوانە کراو لەسەر رووی زەوی پێکەوە دەبەستن. |

| | |
|---|---|
| **Trellised** | تۆڕکراو |
| **Trench** | کەندەك: لەشێوە زانیدا بریتییە لە دۆڵێکی راستی تەسکی شێوە (U)، یان نزمایییەکەی نێوان دوو زنجیرە شاخ. بەڵام لە زەوی ناسی دەریایدا نزمایییەکی تەسکی درێژی بنی دەریا قووڵەکانە کە لاکانی زۆر لێژو تەریب بە لێژی دەریاکەیە. ئەم کەندەکە زیاتر لە 2کم قووڵترە لە بنی ئۆقیانووسی ئەم لاو ئەولای و لەوانەیە درێژییەکەشی بگاتە هەزاران کیلۆمەتر. |
| **Trend** | ئاراستە |
| **Trial, trial axis** | سێتەوەرە |
| **Triassic period** | ماوەی سیانی (ترایاسیك): یەکەم ماوەی چاخی ژیانی ناوەراستە لە دوای ماوەی پێرمی سەر بە چاخی ژیانی کۆن و لە پێش ماوەی جوراسیکەوە دێت. |
| **Triaxon** | سێ تەوەرەییەکان |
| **Tributaries** | لقەکانی رووبار |
| **Triclinic system** | رژێمی سێلاری: یەکێکە لە شەش رژێمەکەی بوون بە کریستاڵ. دەناسرێت بە بوونی سێ تەوەرەی نایەکسان و نا ئەستوون لەسەر یەکتر. |
| **Trigon** | سێگۆشە |
| **Trigonal system** | رژێمی سێ لا: رژێمی بوون بە کریستاڵ کە هاویەکییەکی سیانی هەیە، ئەم رژێمە بەگشتی دادەنرێت بە بەشێك لە رژێمی شەشلا. (بڕوانە رژێمی شەشلا). |
| **Trilobites** | سێپلیەکان: بەو پێ جومگەییە دەریاییانە دەوترێت کە دەگەڕێتەوە بۆ پۆلی ترایلۆبایتا. دەناسرێن بە دابەش بوونی لەشیان بۆ سێ پارچە یان پل. |
| **Trimorphism** | شێوە سیانی: جۆرێکە لە هەمە شێوەیی کە سێ جۆر کریستاڵ هەمان پێکهاتنی کیمیاییان هەیە. (بڕوانە زاراوەی هەمە شێوەیی). |
| **Tripod** | سێ پێییەکان |
| **Triserial** | سێ زنجیرە: ریز بوونی ژوورەکانی فورامنیفێرا بە شێوەی سێ ریزی ستوونی تەریب یان یەکتر بڕ لەگەڵ یەکتر. |
| **Trichoidal** | پێنج خواردووی لوولپێچی |
| **Tropic** | خولگەیی ، کەمەرەیی |
| **Troposphere** | بەرگە هەوای خواروو |

| | |
|---|---|
| **Trough** | دۆڵ، نزمایی: لەشێوە زانیدا هەر نزماییەکی درێژی تەسك لەسەر رووی زەوی. لەزەوی ناسی دەریاییدا هەر نزماییەکی درێژی بنی دەریاکان کە تەنکترە لە رووی قووڵاییەوەو پانترە لە کەندەك. لە بوو بەردزانیدا هەر نزماییەك لە بەشی پشتەوەی پێ بازووییەکان دا لە لێکدابڕاوەکاندا بە مانای گرابن دێت. |
| **True dip** | لاری راستی: ئەو لارییەیە کە بە ئاراستەی ستوونی لەسەر لێدەر دەپێورێت. |
| **Truncated** | بڕاو |
| **Tubular** | لوولەیی |
| **Tufa (calcareous)** | تەنی کلسی: کەفرێکی نیشتووی کیمیاییە پێکهاتووە لە کاربۆناتی کالسیۆم بە هۆی بە هەڵم بوون لە نزیك کانیاوە گەرم یان ساردەکانەوە دروست دەبێت. |
| **Tuff** | تەنی گڕکانی: نیشتوویەکی پەستاوی خۆڵەمێشی گڕکانیە کەلەوانەیە رێژەی لە 50٪ی نیشتووی دەنکۆڵەی قەبارە وەك لم و قوڕی تیادا بێت . دەبێت ئەم زاراوەیە تێکەڵ نەکرێت لەگەڵ زاراوەی تەنی کلسی (tufa). |
| **Tunnel** | تونێل |
| **Turbidity current** | تەوژمی شلەژاو یان تەوژمی چڕی: بریتییە لە تەوژمی چڕی لە هەوا یان ئاو یان هەر تراوێکدا، کە لە ئەنجامی جیاوازی چڕی مادەکانەوە دروست دەبێت. |
| **Turgescence** | ئاوساو |
| **Twin** | دووانە: گەشەکردنی دووانەیی یان زیاتری یەك کریستاڵی خاوێك. |
| **Type locality** | شوێنی نموونەیی: شوێنی یەکەیەکی چینزانی (وەك پێکهاتوو) کە ناوی پێکهاتووەکەی لێوە وەرگیراوەو یەکەم جار لەوێ وەسفکراوە کە بڕگەی نموونەیی لێیە. وەك پێکهاتووی بارسەرین کە شوێنی نموونەییەکەی گوندی بارسەرینە لە ناوچەی رەواندوز. |
| **Type section** | بڕگەی نموونەیی: لە دوایەکی بنچینەیی چینەکان کە لە شوێنی نموونەیی وەسفکراوە، باشتر وایە لەو شوێنەدابێ کە بڕگەکە گەورەترین ئەستووری هەبێت و هەمووی دەرکەوتوو بێت یان هیچ نەبێت سەروو بنی دیار بێت. بۆ هەر یەکەیەکی چینزانی بڕگەیەکی نموونەیی هەیە لە کاتی پێویستدا بڕگەی نموونەی تر دادەنرێت. |

# -Uu-

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| *Ubac* | لێژی جەمسەری |
| *Ultimate* | کۆتایی |
| *Ultra-* | سەروو ، ژوور |
| *Ultra basic rock (Ultra mafic rock)* | کەڤری سەروو تفتی: ئەو کەڤرە ئاگرینانەیە کە بەشێوەیەکی سەرەکی پێکهاتووە لە خاوە مافیەکان (خاوە فیرۆمەگنیسیەکان). ئەو کەڤرانەیە کە بە گشتی رێژەی سلیکا تیایاندا لە 45٪ دا کەمترە. وەك کەڤری پیریدۆتایت کە بەشێوەیەکی سەرەکی لە خاوی ئۆلیڤین دروست بووە. |
| *Ultradomenant* | زۆر زاڵ، زۆر بلاو |
| *Ultrasonic* | سەروو بیستن |
| *Ultraviolet* | سەروو بنەوشەیی،ژوور بنەوشەیی |
| *Umbilical plug* | دەمەوانەی ناوکی |
| *Umbilicus* | ناوك |
| *Umbo* | دەنووك: پێکهاتوویەکی شێوە دەنوکە لە لەپکەی نەرمۆڵە دوو لەپکەییەکاندا کە خاڵی گەورەترین چەمانەوەی تیادایە بەگشتی بەهەمان مانای (beak) بەکاردێت بەڵام لە زۆربەی لەپکەکاندا هەردوو زاراوەکە پێویستە بەکاربهێنرێت. |
| *Unbedded* | بێچین |
| *Unbreakable* | ناشکێت |
| *Uncased* | ناوپۆش نەکراو |
| *Unclassified* | پولێن نەکراو |
| *Uncoloured* | بێرەنگ |
| *Unconformity* | نایەککەوتوو: بریتییە لە پچڕانێك یان بۆشاییەك لە تۆمارگەی جیۆلۆجیدا کاتێك کە یەکەیەکی کەڤری دادەپۆشرێت بە یەکەیەکی تر کە خۆی لە بنچینەدا لە دوای نایەت. وەك داپۆشینی کەڤری ئاگری بەهۆی کەڤرە نیشتووییەکانەوە. لەوانەیە پچڕانەکە بەهۆی نەنیشتن یان داماڵین و داخورانەوە ببێت. جۆرەکانی نایەککەوتن لەوانەیە تەریب یان گۆشەدار یان نەنیشتن بێت. |
| *Unconsolidated* | رەق نەبوو |
| *Uncovered* | بینراو،دانەپۆشراو |

| | |
|---|---|
| *Underlying* | ژێری |
| *Under fold* | چینە چەماوەی ناوەندی |
| *Underground corrosion* | داخورانی ناوەکی یان ژێر زەوی |
| *Underground water* | ئاوی ژێر زەوی |
| *Under stratum* | ژێرە چین |
| *Undisturbed* | نەشێواو |
| *Undulating* | شەپۆلدار |
| *Unequigranular* | دەنکۆڵە نایەکسانەکان |
| *Uneven* | ناڕێك و پێك، نابەردەوام |
| *Uniaxial* | یەکتەوەرە: بەو کریستاڵە دەوترێت کە یەك تەوەرەی بینایی هەیە، وەك کریستاڵە چوار لا و شەشلاکان. |
| *Unicellular* | یەك خانە |
| *Uniclinal* | یەکلاری (بەهەمان مانای Monocline دێت). |
| *Uniformitarianism* | یونیفۆرمیتاریانیزم: یەکێکە لە بنەما سەرەکییەکانی زەویناسی کە دەڵێت ئەو کردارانەی کە ئێستا کاردەکەنە سەر رووی زەوی و دەبنە هۆی گۆڕانی هەمان ئەو کردارانەن کە لەسەردەمە جیۆلۆجییەکانی کۆندا روویان داوە. پشت دەبەستێت بە رستەی (ئێستا کلیلی دەروازەی کۆنە). |
| *Uniformity* | یەکشێوە، چوونیەك |
| *Unimodal sediment* | نیشتووی یەك مۆدیل: ئەو نیشتووەیە کە بڵاوبوونەوەی قەبارەی دەنکۆڵەکانی یەك قەبارەیە واتە یەك جۆر لە قەبارە زاڵە تیایدا. وەك چەوی کەنار رووبارەکان . |
| *Uniserial* | یەك زنجیرە: ریزبونی ژوورەکانی فۆرامنیفێرا بەشێوەی یەکریزی ستوونی یەك لەدواییەك. |
| *Unit* | یەکە |
| *Unit cell* | یەکەی خانە: یەکەیەکی سەرەکی تۆڕە کریستاڵییە کە بەهۆی دووبارەبونەوەی رێك وپێکیەوە لە بۆشایدا دروست دەبێت. |
| *Univalent* | یەك هاوهێزی |
| *Universe* | گەردوون، جیهان |
| *Unusual* | نا ئاسایی |
| *Up burst* | هەڵچون |
| *Uplifting* | بەرزبوونەوە |
| *Upper* | سەروو، سەرەوە |
| *Upset* | شێواندن |

*Upwa/U-val*

| | |
|---|---|
| ***Upwards*** | بەرەوژوور |
| ***Uranium- lead age method*** | ڕێگەی یورانیۆم – قورقوشم بۆ دیاریکردنی تەمەن: ژمێریار کردنی تەمەن بە ساڵ بۆ مادە جیۆلۆجییەکان لەسەر بنەمای ڕێژەی شیبوونەوەو هەڵوەشانی مادە تیشکدەرەکان وەك یورانیۆم 238 بۆ قورقوشمی 206 و هەروەها هەڵوەشانی یورانیۆم 235 بۆ قورقوشمی 207. |
| ***Uranus*** | ئۆرانۆس: یەکێکە لە هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆر. |
| ***Urchin (sea urchin)*** | ژیژکی دەریا |
| ***U- valley*** | دۆڵی شێوە U : ئەو دۆڵەیە کە شێوەکەی لە شێوەی تیپی (U) ئینگلیزی دەچێت واتە قوڵییەکەی زۆرترە لە پانییەکەی بەگشتی ئەم شێوەیە شێوەی قۆناغی پێگەیشتنی دۆڵی ڕووبارەکانە. |

# -Vv-

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| *Vacancy* | بۆشایی |
| *Vacuoles* | بۆشاییەکان |
| *Vadose water* | ئاوی هەڵواسراو: ئاوی ناوچەی هەوایی لە خۆڵدا. |
| *Vale* | دۆڵی بچوك |
| *Valence* | هاوهێزی |
| *Valley* | دۆڵ: لەشێوەزانیدا بەو پارچە زەوییە نزمە دەوترێت کە ئەم لاو ئەولاکەی بەرزە، بەگشتی دەکەوێتە نێوان دوو ریزە گرد یان چیا، و داخورانی بەهۆی ئاوەوە پێوە دیارە. |
| *Value* | نرخ |
| *Valve* | دەروازە، لەپکە: بەشێك یان زیاتر لەیەکەکانی پەیکەری گیانەوەران کە هەموو لەپکەکەیان سەدەفەکە پێکدەهێنێت. بۆ نموونە پێسکییەکان سەدەفەکەیان لەیەك لەپکە پێکهاتووە. بەڵام پێبازووییەکان سەدەفەکەیان لە دوو لەپکە پێکهاتووە. |
| *Vapor* | هەڵم |
| *Variable* | گۆڕاو |
| *Variance* | جیاوازی |
| *Variform* | هەمە شێوە |
| *Various* | هەمەڕەنگ |
| *Variometer* | گۆڕانپێو |
| *Vascular* | دەفرە شانە |
| *Vault* | گومەزی |
| *Vector* | بڕی ئاراستە کراو |
| *Vegetable* | رووەکی |
| *Vein* | دەمار: تەنێکی شێوە پەڕەی خاوەکانە کە ئەو نێوانە روو و درزانە پڕدەکاتەوە کە لە کەڤرەکاندا هەیە زۆربەیان لە بنچینەدا ئاگرین ئیتر بەشێوەیەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بێت، هەروەها لەوانەیە بەهۆی کردارەکانی نیشتنەوە دروست ببێت. |
| *Velocity* | تاودان، خێرایی |
| *Vent* | دەمی گڕکان |
| *Ventral* | سکی |
| *Venous* | ڤینۆس : یەکێکە لە هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆر. |

| | |
|---|---|
| *Vermicular* | کرمی |
| *Vertebrates* | بڕبڕەدارەکان: ئەو گیانەوەرانەن کە دەناسرێن بە بوونی بڕبڕەی پشت وەك مرۆڤـ. |
| *Vibration* | لەرینەوە |
| *Virgin* | سروشتی |
| *Vis- a- vis (Mirror image)* | وێنەی ئاوێنەیی |
| *Viscosity* | لینجی: یەکێکە لە سیفەتەکانی مادە کە بریتییە لە بەرگری ناوەکی بۆ بڵاوبونەوە. بریتییە لە لێکخشانی ناوەکی. |
| *Vitreous* | شوشەیی: جۆرێکە لە بریسکە وەك شوشە وایە. بۆ نموونە کوارتز بریسکەیەکی شوشەیی هەیە. |
| *Vitrification* | بوون بە شوشە: دروست بوونی مادەی شوشەی یان نا کریستاڵی. |
| *Volatile* | هەڵمیو |
| *Volcanic* | گڕکانی |
| *Volcano* | گڕکان: ئەو شوێنە یان کونەی کە لەسەر رووی زەوییەو لێوەی ماگما دێتە دەرێ، بەگشتی شێوەی قوچەکیە کە لە ئەنجامی دەرپەڕینی مادەکاندا دروست دەبێت. |
| *Volcanology* | زانستی گڕکان: ئەو بەشەیە لە زەویناسی کە لە شێوەو دروست بوون و پێکهاتوی گڕکانەکان دەکۆڵێتەوە. |
| *Volume* | قەبارە |
| *Volumetric analysis* | قەبارە شیکاری |
| *Volute* | بۆشایی |
| *Vug* | کونی گەورە |
| *V- valley* | دۆڵی شێوە -V– : ئەو دۆڵەیە کە شێوەکەی وەك تیپی (V) ئینگلیزی وایە واتە قوڵییەکەی زۆر زیاترە لە پانییەکەی، ئەمەش بە گشتی شێوەی دۆڵی رووبارەکانە لە قۆناغی هەرزەیی یان گەنجیدا. |

# -Ww-

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| *Wacke* | پیس (واکی): نیشتووی هەمە چەشنە شێوەو قەبارەی لمی، وەك کورتکراوەی وشەی گرێی واکی بەکاردەهێنرێت هەر چەندە زۆر بڵاو نییە. |
| *Wad* | گورزە |
| *Wady* | دۆڵ |
| *Wall* | دیوار: لە بوویەردزانیدا بەو چینەی دەرەوەی کە دەوری بەشی ناوەوەی بێبڕبڕەکانی داوە دەوترێت . لە لێکترازاودا ئەو کەڤرەی کە دەکەوێتە ئەم لاو لای هێڵی لێکترازاوەوە. وەك دیواری هەڵواسراو و پادیوار. |
| *Warming spring* | کانیاوی گەرم |
| *Warp* | چەمانەوە |
| *Warped* | چەماوە |
| *Washing* | شۆرانەوە |
| *Waste* | پاشماوە: ئەو ماددە پێکەوە نەبەستراوانەیە کە لە ئەنجامی کەشاندنی فیزیایی و کیمیاییەوە دروست دەبن و دەگوێزرێنەوە بەرەو خواررووی لێژگەکە یان بە هۆی ئاوەوە هەڵدەگیرێن بەرەو دەریا. وەك پاشماوەی کەڤری. |
| *Water bearing* | ئاوی |
| *Water falls* | تاڤگە |
| *Water flooding* | لافاو |
| *Water level map* | نەخشەی ئاستی ئاوی ژێر زەوی |
| *Water table* | ئاستی ئاو |
| *Water tight* | بەنداو |
| *Wave* | شەپۆل |
| *Wave crest* | لوتکەی شەپۆل |
| *Wavy* | شەپۆلاوی |
| *Wax* | مۆم |
| *Wear* | داخوران: کەمبوونەوەی قەبارە یان شێوەی پارچە وردەکانی کەڤرێك بەهۆی یەکێك یان زیاتر لە کردارە میکانیکیەکانی داخوران یان پەستان یان سافکردن. |

| | |
|---|---|
| ***Weathering*** | کەشاندن: بریتییە لە کۆمەڵە کردارێك کە بەشێکن لە داماڵین وبەسەر کەڤر یان نیشتووەکاندا دێت و دەبێتە هۆی گۆڕینی ڕەنگ و تنراو پێکهاتن و شێوەی ئەم نیشتوانە لەگەڵ گواستنەوەیەکی زۆر کەم یان هەر نەگواستنەوەیان. دوو بەشی سەرەکی هەیە کەشاندنی فیزیایی و کەشاندنی کیمیایی. |
| ***Wedge*** | پواز |
| ***Weight*** | کێش |
| ***Well*** | بیر: کونێکی قووڵی شاوڵییە کە هەڵدەکەندرێت بۆ بە دەست کەوتنی ئاو یان نەوت یان بۆ هەر هۆیەکی تر. |
| ***Well logging*** | تۆماری بیر،لۆگی بیر:زاراوەیەکە بەکاردێت بۆ ئەو ڕێگایانەی کە ڕەوشە فیزیاوییە جیاوازەکانی بەردەکانی ناو بیرێك دەپێوێت(بەهۆی شۆڕکردنەوەی ئامێری تایبەت بۆ ناو بیرەکە).تۆماری بیرەکان گرنگی تایبەتی هەیە لەوەر گرتنی زانیاری تەواو سەبارەت بە چینە بەردەکانی ناو بیرەکە .لەڕێگا جیاوازەکانی وەگ SPوبەرگریی و گاماو نیوترۆن ودەنگی و...هتد. |
| ***Wet*** | تەڕ |
| ***Wetness*** | شێ |
| ***Whir pod*** | گێژاو |
| ***Whir wind*** | گێژەڵووکە |
| ***Wild fire*** | گازی کانەکان |
| ***Wind*** | با |
| ***Windward*** | ڕووەو با |
| ***Witherite*** | وزەرایت: خامێکی سپی زەردباو یان خۆڵەمێشییە لەسەر ڕژێمی لەبزینەیی دەبێت بە کریستاڵ و لە کۆمەڵەی ئەرەگۆنایتە و پێکهاتنی کیمیایی بریتییە لە $Ba\,CO_3$ . |
| ***Wood*** | تەختە: بریتییە لە مادەی زایلەم |
| ***Worm*** | کرم |

# - Xx -

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| *Xenolith* | زینۆلیث: بریتییە لەو مادە نارەکیەی ناو کەڤری ئاگرین کە لە بنچینەدا پێکەوە دروست نەبوون لەگەڵ کەڤرە ئاگرییەکەدا. |
| *Xenomorphic* | بێڕوو |
| *Xenothermal* | کانگەی گەرمایی |
| *X- ray analysis* | شیکردنەوە بە تیشکی سینی |
| *X- ray diffraction* | تیشکی سینی لادراو |
| *X- ray spectrometry* | تیشکی سینی شەبەنگی |
| *Xylem* | تەختە، زایلەم |

# -Yy-

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| *Year* | ساڵ |
| *Yielding rock* | کەڤری پلاستیکی |
| *Young* | هەرزە، تازە، نوێ |
| *Young's modulus* | هاوکۆلکەی یۆنگ |
| *Youth* | گەنج، لاو |

# -Zz-

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| *Zeolite* | زیۆلایت: کۆمەڵێك خاوی سلیکاتی ئەلەمنیۆمی ئاوییە کە دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵەی تەکتۆ سلیکات. هەندێ جار رەنگیان زەرد یان بێرەنگن. |
| *Zenith* | لوتکە، تەوقە سەر |
| *Zeroing* | بەسفرکردن |
| *Zigger* | پاڵاوتنی ئاو |
| *Zig- Zag* | زیگزاگ |
| *Zinkite* | زنیکایت: خاوێکی سووری تێر یان زەردە کە زوو دەشکێت پێکهاتووە لە (ZnMn)O یەکێکە لە خامەکانی زینك. |
| *Zircon* | زیرکۆن: خاوێکی هەمە رەنگە، پێکهاتووە لە $ZrSiO_4$ و لەسەر رژێمی چوار لا دەبێت بە کریستاڵ، وەك خاوێکی نا سەرەکی لە کەڤرە ئاگرییەکاندا و نایس و بەردی کلس و بەردی لمیدا هەیە. خامێکی سەرەکییە بۆ زرکۆنیۆم، پاش بڕینی دەتوانرێت وەك بەردە بەنرخەکان بەکاربهێنرێت. |
| *Zig- zag fold* | چینە چەماوەی زیگزاگی |
| *Zonation* | ناوچەگەری: بارودۆخی ریزبوون یان دروست بوون لە شێوەی ناوچە ناوچەدا یان پشتێنەدا. |
| *Zone* | ناوچە ، پشتێنە : لە ژینگە زانیدا ئەو شوێنە بایوجیوگرافیاییە کە دەناسرێت بە بوونی جۆرێکی تایبەت لە ئاوو هەوا و رووەك و گیانەوەران. |
| *Zooecium* | شوێن |
| *Zoogenic* | ئەندامی، گیانەوەری |
| *Zygote* | هێلکەی پیتێنراو |

# سەرچاوەکان

## English References:

+Al- Khatib, A. SH. (ed.), 1975, A new dictionary of petroleum and the oil industry, English- Arabic, with illustration, Libairie Du liban, Beirut, 577p.

+Bates, R.L. and Jackson, J.A. (eds.), 1984, Dictionary of geological terms, Anchor press / Doubleday, Garden City, New York, 331p.

+Chhatwal, M., 1998, Dictionary of Geology, 2nd ed., Anmol Pub.Pvt.Ltd., New Delhi, 349p.

+Holmes, A., 1965, Principles of physical Geology, Thomas Nelson Ltd., London, 1288p.

+Hornby, A.S., 1995, Oxford Advanced Learner's Dictionary of Current English 2000, Oxford, University Press, 1428p.

+Lapedes, D.N. (ed.), 1978, Encyclopedia of the Geological Sciences, Mc Graw - Hill book company, New York, 915p.

+Lutgens, F.K. and Tarbuck, E.J. , 1986, Essentials of Geology, 2nd ed., Charles E. Merrill Publishing company, Columbus, 346p.

+Parker, S.P. (ed.), 1984, Dictionary of Earth Sciences, Mc Graw- Hill. Book Company, New York, 837p.

+Watt, A., 1982, Illustrated Dictionary of geology, the principles of geology, explained and illustrated, Librairie Du Liban, Longman, York press, Beirut, 328p.

+Whitten, D.G.A. and Brooks, J.R., 1972, Dictionary of Geology, Penguin Books, England, 495p.

## المصادر العربية:

-معجم الجيولوجيا، انكليزى – عربى – فرنسى، 1971، جامعة الدول العربية، المنظمة العربية للتربية و الثقافة و العلوم، الرباط، المملكة المغربية، 238ص.

-كمال جلال غريب، 1979، القاموس العلمى، عربى – ئينگليزى – كردى، الجزء الثاني، الطبعة الاولى – مطبوعات المجمع العلمى الكردى، بغداد، 403ص.

-د.عبدالقادر عابد، د. شاكر رسمى المقبل و د. سعد حسن الباشا، 1980، الجيولوجيا

العامة. مجمع اللغة العربية الاردني، ترجمة، 792ص.
-د. سهل السنوي، (اعداد)، 1982، معجم مصطاحات علم الارض، مديرية د ارالكتب للطباعة و النشر جامعة الموصل، العراق، 126 ص.
-البعلبكي، منير، 2001، المورد، انجليزي- عربي، دار العلم للملايين، بيروت، 1118 ص.
-الرازي، محمد بن ابي بكر، 1981، مختار الصحاح، دار الكتاب العربي، بيروت، لبنان، 745ص.
-النافوسي، ثنية، 1985 ،معجم المصطلحات العلمية - الفنية و التطبيقية، وزارة التعليم العالي و البحث العلمي، جامعة الموصل ، 838ص.
-واط، الك، 1982، قاموس الجيولوجية المصور، انجليزي- عربي و عربي - انجليزي، لبنان- مكتبة لبنان، 328ص.
-الياس، الياس انطوان و ادوار الياس، 1985، قاموس الجيب، عربي- انجليزي ، دار الجيل، بيروت، 532ص.
-عسكر، موفق اسعد، د.عبدالقادر البيطاروعبدالوهاب النجم ،1986-1987، معجم الرافدين، انكليزي - عربي، الدار الوطنية للتوزيع و الاعلان، بغداد، 1097ص.

سەرچاوە کوردییەکان:
- سەعید، پەری عومەر، 1986، فەرهەنگی چیمەنتۆ، ئینگلیزی - عەرەبی - کوردی، 119ل.
-غریب، کمال جلال، 1974، القاموس العلمی، عەربی- کوردی، بەشی یەکەم، چاپخانەی کامەرانی.
-غریب، کمال جلال، 1979، القاموس العلمی، عەربی- ئینگلیزی- کوردی، بەشی دووەم، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد،.
-غریب، کمال جلال، 1983، القاموس العلمی، عەربی- ئینگلیزی- کوردی، بەشی سێیەم، بەیارمەتی وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان،.
-موکریانی، گیو، 1984 ،فەرهەنگی نۆبەرە (الباکورە)، عەربی- کوردی، بەشی یەکەم، چاپخانەی الحوادث - بغداد،.
-خاڵ، شێخ محمد، فەرهەنگی خاڵ، کوردی - کوردی، بەشی یەکەم، 1960 و بەشی دووەم 1964 و بەشی سێیەم 1974، چاپخانەی کامەرانی، سلێمانی.
-موکریانی، هەژار، 1991، فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە، کوردی - فارسی، تاران، ئێران.
-غریب، کمال جلال، 1975، فەرهەنگی زانیاری وێنەدار، عەربی- ئینگلیزی - کوردی، چاپخانەی الاجیال.

-عبدول، جمال، 1998، فەرهەنگی کیمیا، ئینگلیزی- عەربی- کوردی، ، سلێمانی، 389ل.
-عبدول، جمال، 2001، بەرکولێکیزانستە زاراوەسازی کوردی، یەکەم چاپ، 175ل.
-عەبدول، جمال، زیوار، 1995، دەستە فەرهەنگێکی زانستییە، ئینگلیزی- عەرەبی

-کوردی، هەولێر، 336ل.
-غریب ، کمال جلال، 2002 ،کەڵە فەرهەنگیمەعدەنەکان، کوردیی -عەرەبی- ئینگلیزی،سلێمانی ، 274 ل.

# فەرهەنگی زەویناسی

## ئینگلیزیی-کوردیی

ئامادەکردنی
د.ئیبراهیم محەمەدجەزا محیّدین
بابارەسول غەفورعیسا کەیوان محەمەد رەزا

لەم فەرهەنگەدا زیاتر لەدووهەزارو پیّنج سەدوشە وزاراوەی زەویناسی لەزمانی ئینگلیزییەوە کراوە بە کوردیی وشیکراوەتەوە

یەکەم چاپ 2702 کوردی
دووەم چاپ 2709 کوردی ( ئیلکترۆنی )

*ناوی کتێب: فەرهەنگی زەویناسی
*ئامادەکردنی: د.ئیبراهیم محەمەدجەزا محێدین
باباڕەسول غەفورعیسا کەیوان محەمەد ڕەزا

*یەکەم چاپ: 1423 کۆچی، 2002 زایینی، 2702 کوردی
*دووەم چاپ: 2009 زایینی (ئێلیکترۆنی)
*کۆمپیوتەر: تاڤگەفایەق
*چاپخانە: بەدرخان
*ژمارەی سپاردن: 155 بۆ ساڵی 2002- وەزارەتی ڕۆشنبیری
*تیراژ:500دانە
*لەسەر ئەرکی کۆمەڵەی جیۆلۆجی کوردستان /لقی سلێمانی لەچاپدراوە

*وێنەی بەرگ: پانەبڕگەیەك لەچینەچەماوەی کووڕ وچاڵ کەبەهۆی لێکترازاوی بچوکەوە کەرت بوون( پێکهاتووی بالآمبۆ) دا پۆشراوە بەچینێکی تەنك لەخۆڵ، نزیك لوتکەی چینەچەماوەئالۆزی ئەزمەڕ،سلێمانی، کوردستان( بەکامێرای کارزان ئەکرەم ئەحمەد).

